**پێشکەشە بە سەرجەم**

**1- ئەو ژن‌و کچانەی کە بڕوایان بە گۆڕان هەیەو کار بۆ گۆڕینی کۆمەڵگە دەکەن**

**2- بە ژنانی کەرکوک**

## سوپاس و پێزانین

**سوپاسی هەموو ئەو خەمخۆرانە دەکەین کە لەم توێژینەوەیەدا هاوکارمان بوون**

1- ڕێکخراوی undp

2- پارێزگاری کەرکوک و سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگا.

4- ڕێکخراوە لۆکاڵییەکانی کەرکوک

4- یەکێتی ژنان، کۆمەڵەی ئافرەتان و یەکێتی ئافرەتان و ڕێکخراوەکانی دیکەی ژنان لە کەرکوک.

5- بەرپرسی ئیداری و ئاسایشی شارەکانی پردی، داقوق، ودبز، لەیلان، شوان، قەرەهەنجیر.

6- دانیشتوانی گوندەکانی کە تیمەکان سەردانیان کردون.

کە بەگشتی هاوکرای سەرخستنی پرۆژەکەیان کرد.

## پوختەی توێژینەوەکە

ئەم توێژینەوەی بریتییە لەوەرگرتنی زانیاری لەلایەن چوار هەزار ژنی شاری کەرکوک و دەروبەریەوە. کە فۆڕمی راپرسییەکە 17 پرسیاری لەخۆ گرتبوو وەك لە پاشکۆی ئەم توێژینەوەیەدا دەیبینین.

دەرخستەی فۆڕمەکان و کۆدنەوەی داتاکان کۆمەڵێك دەرئەنجامی نوێ دەدەنە دەستەوە کە خوێنەر لە خوێندنەوەی توێژینەوەکەدا پێیان دەگات.

بەگشتی توێژینەوەکە دابەشکراوە بەسەر چوار بەشی سەرەکی و چەند پاشکۆیەکدا.

لەبەشی یەکەمدا: پێناسی توێژینەوەکەو ئەو کێشانەی توێژینەوەکە هاتووەتە رێگایان و گرنگی و ئامانجەکانی توێژینەوەکە دەبینی.

لەبەشی دووەمدا: بابەتی تیۆری توێژینەوەکە دەخوێنیتەوە.

لەبەشی سێیەمدا: هەنگاوە مەیدانیەکانی سامپڵی توێژینەوەکە خراوەتە روو.

لەبەشی چوارەمدا: پەیوەندیەکانی نێوان خشتەو نەخشەکان و بابەتە تیۆریەکان خراوەتە روو.

لەگەڵ پلشکۆی دەرئەنجام و راسپاردەکان و فۆڕمی راپرسییەکەو پوختەی لێتوێژینەوە بەزمانی ئینگلیزی و چەندین وێنەی تیمەکان لەکاتی راپەڕاندنی کارەکەیاندا.

# پێرستی بابەتەکان


| ز | بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |
| 1. | پێشکەش | 3 |
| 2. | سوپاس‌و پێزانین | 4 |
| 3. | پوختەی توێژینەوەکە | 5 |
| 4. | پێڕست | 6 |
| 5. | پێشەکی | 9 |
| 6. | بەشی یەکەم | 11 |
| 7. | کێشەی توێژینەوە | 12 |
| 8. | گرنگی توێژینەوە | 17 |
| 9. | دیاریکردنی چەمکەکان | 22 |
| 10. | بەشی دووەم | 47 |
| 11. | ژن‌و بەشداریکردن لە هەڵبژاردندا | 48 |
| 12. | ژن لە کەلتوری ئێمەدا | 66 |
| 13. | کەلتوری بەعس | 73 |
| 14. | بەعس‌و بەشداری ئەوانی دیکە | 77 |
| 15. | بەعس‌و پرسی ژن | 80 |
| 16. | کەرکوك‌و سەرکوتگەرایی | 82 |
| 17. | ژن‌و بەشداری کۆمەڵایەتی | 91 |
| 18. | دیموکراسی‌و هەڵبژاردن | 97 |

19. ژن و بەشداری سیاسی 106
20. بەشی سێیەم 117
21. میتۆدی توێژینەوە 118
22. بەشی چوارەم 123
23. بـەراوردکردنی بەشـەکانی بـەگوێرەی خـشتەو شێوەکان 123
24. ڕاسپاردەکان 132
25. دەرئەنجامەکانی توێژینەوەکە 134
26. پاشکۆی 1 (خشتەو شێوەکان) 135
27. پاشکۆی 2 (فۆڕمی ڕاپرسی) 157
28. پاشکۆی 3 (لیستی بەشداران) 162
29. پاشکۆی 4 (وێنەکان) 164
30. پوختەی توێژینەوەکە بە ئینگلیزی 171

## پێشەکی

خوێنەری هێژا ئەم کتێبەی بەردەستان، تەقەلایەکە بەگوێرەی توانای سەنتەری پەنا بەهاوکاری (Undp) بەمەبەستی کاراکردنی بەشداری سیاسیانەی ئافرەتان. لەتوێژینەوەکەدا کە لە کەرکوك‌و دەروبەری بەڕێوەچووە. نزیکەی چوار هەزار فۆڕمی راپرسی پڕ کراوەتەوە، لە رێگای ئەو فۆڕمانەوە ئێمە توانیومانە بە بەشێك لە بیروڕاکانی ژنانی کەرکوك ئاشنا بین، کە بڕوامان وایە ئەم بابەتە بایەخی خۆی هەیە.

لەراستیدا ئەم توێژینەوەیە لە زۆر رووەوە بێ گیروگرت نەبوو لەوانە بارودۆخی ئاسایشی کەرکوك‌و دەوروبەری لەهەندێ شوێن هاوکاری نەکردنی حکومەت لەگەڵ کارمەندانی ئێمە بەتایبەت لە ناحیەی تازە، کەم ئەزموونی ئەو ستافەی بەکارەکە هەستان لەبەر ئەوەی ئەوە یەکەمین جار بوو بەو فراوانیە پڕۆژەیەك لە سنوری کەرکوکدا بەڕێوە بچێت، لەگەڵ ئەوەتدا هەموو ئەندامانی ستافەکە بە دڵسۆزی‌و لێبوردەیی زۆرەوە کارەکەیان رادەپەڕاندو لەکاتی هەرگیرو گرفتێکدا پرس‌و رایان بە یەکدی دەکرد، دەشێ ئەم سەرەتای کارەی سەنتەری پەنا بەهاوکاری (Undp) بێکەم‌و کوڕی نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا بڕوامان وایە کارێکی وا بایەخ‌و گرنگی تایبەتی خۆی هەیە بەتایبەت بۆ ئەو توێژەرو لێکۆڵەرانەی دەیانەوێت لەسەر بارودۆخی ژنان لە کەرکوك بنوسن..

ئەم توێژینەوەیە بە سەر چوار بەشدا دابەش بووە کە دواتر خوێنەر لەناوەڕۆکدا بەو بەشانە ئاسنا دەبێ.

٭ بەشی یەکەم: باس لە پێناسی توێژینەوەکەو، کێشەکانی توێژینەوەو، گرنگیەکەو ئامانج لەم توێژینەوەیە دەکات

٭ بەشی دووەم: بابەتی تیۆری توێژینەوەکەیە لەو بەشەدا باس لە رۆڵی ژن لە کۆمەڵگەی کەرکوکدا کراوە، ئایا ژن خاوەنی چ پێگەو شونێێکە لە کۆمەڵگەی کەرکوکدا؟!

٭ بەشی سێیەم: قسەکردنە لە هەنگاوە مەیدانیەکانی توێژینەوەکە:

٭ بەشی چوارەم: بەراوردکاری رێژەو دەرخستەی خشتەو نەخشەکان‌و پەیوەندیانە بە بابەتە تیۆریەکەوە.

هەر لەم توێژینەوەیەجا لە پاشکۆیەکدا وێنەی فۆڕمی راپرسیەکەو، وێنەی چالاکی مەیدانی‌و سەردانی تیمەکان، پوختەی توێژینەوەکە بەزمانی ئنیگلیزی بلاوکراوەتەوە.

# بەشی یەکەم

## پـێـنـاسـی تـوێـژیـنـەوە

- کێشەی توێژینەوە
- گرنگی توێژینەوە
- ئامانجی توێژینەوە
- سنوری توێژینەوە
- دیاریکردنی چەمکەکان

## كێشەی توێژینەوە

یەكێك لەو هۆكارانـەی وای كـرد, ئـەم توێژینەوەیـە ئـەنجام بـدرێت،, هەموو ئەو پاڵنەرانە بوون، كە بەشێك لە تێڕوانینی ئێمە بـۆ بەشـداری ژن لەپرۆسەی سیاسیدا پێك دەهێنا، بەڵام ئەو هۆكارانـەی لای زۆرینـەی ئەو كەسـانەی لەسـەر مەسـەلەی بەشـداری سیاسـیدا گفتوگۆمـان دەكـرد، جێگەی پرسیار بوو، گوایە كۆمەڵگای ئێمە ناتوانێت پێگەیـەكی سیاسـی بەژن ببەخشێت، ئەگەرچی توێژینەوەیـەكی وامـان لەبەردەسـتدا نییـە، كەپاڵپـشتی رای لـەو بابەتـە بكـات، هـەر لەبەرئەوەیـە ئەمانـە لەسـەر ئاستی سستمی بەڕێوەبردن و لەسەر ئاستی ئەكادیمی، كەمتر وەك بەڵگە حـساب دەكرێـت، هۆكـاری ئـەم حاڵەتـە دەگەڕێننـەوە بۆئـەوەی ئەمانـە بەرێژەیەك نین تاكو گشتاندنیان بەسەر تـەواوی كۆمـەڵگادا بـۆ بكرێـت، هەروەها ئەمانە بەهیچ كلۆجێك نابن بەنوێنەری یان نمونەی كۆمـەڵگاو كارەكان تەنها كارێكی تاكەكانە، بەتایبەتی ئەوانـەی خـاوەنی پێگەیـەكی لاوازن لەبەشـداریدا، ئێمـە وەك ڕێكخـراوی پـەنا، بـەپێی ئـەو زانیـاری و دیكۆمێنتانــەی هــەن لەســەر دیــاردەی بەشــداریكردنی سیاســیانەی ژن، توانیومانــە ئــەوە لای خۆمــان ڕۆشــن بكــەین، كــاركردن بــەو ئاراســتەیە بـەرەو ئـەوە دەمانبـات، بتـوانین لەسـەر ئاسـتە لۆكاڵیـەكان هـەموو ئـەو حاڵەتانە ئاشكرا بكەین، كە پێشتر هیچ جۆرە حـسابێكیان بـۆ نـەكرابوو،

بەلأم هێشتا ئەو پرسیارە لای هزری هەندێ کەسی دەسستەبژێر جێگەی قسەکردن بوو، لەبەرئەوە هەوڵماندا لەرێی توێژینەوەیەکی زانستییەوە سامپڵ بۆ ئاستی بەشداریکردنی ژن لەبواری سیاسەتو کاریگەری ئەو لەپرۆسەی هەڵبژاردندا وەربگرین، تاکو بەهۆیەوە، ئەوە بسەلمێنین کەبەشداری سیاسی وەك یەکێك لە خەسلەتە پۆزەتیفەکانی ژیانی مرۆڤ، لەناو کایەی بیرکردنەوەی ئێمەدا بوونی هەیەو بەدورنییە لەرەگەزەکانی وەك فکر، کەلتور، نەریت ، کایەی کۆمەلأیەتی .

ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی لەو جۆرە. کەپرسیاری یان گریمانەی بەشداریکردنی سیاسیانە لەناو کۆمەڵگای کوردیدا بکات، کارێکی ئاسان نییەو هەروەها لەکاتی ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی لەو جۆرەدا، کارەکان بە هێوری و بەکاوەخۆ نایەن بەدەستەوە، هەندێك رسکمان دانابوو، لەکاتی ئەنجامدانی پرۆژەکەدا بێتە رێگامان، کەلەراستیدا رسکی دیاربوون، پێمانوابوو کۆمەڵگای ئێمە گرنگی توێژینەوە یان گرنگی ئامار بەهەند وەرناگرن، ، وامانداناوبوو، کەمترین کەس هاوکاری تیمەکانی ئێمە دەکەن، بەلام خۆشبەختانە توانرا کارەکان بەسەرکەوتوویی ئەنجام بدرێت، ئەمە جگە لەوەی وەرگرتنی ئامارێکی لەو جۆرە کارێکی ئاسان نییە، بەتایبەتی بۆ رێکخراوێکی ناحکومی لۆکالی وەك ئێمە، کەتوێژینەوەیەکی بەو قەبارەیە، بۆخۆی تێچونی ئابوری زۆری دەوێت و پێویستی بەپاڵپشتی دارایی و ئەکادیمی هەیە، راستە کارەکانمان وەك ئەوەی خۆمان دەمانخواست بەدەستمانەوە نەهات،، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا توانیمان لەرێگەی ئەو سامپڵەی وەرمانگرتووە ئەوەندە داتا کۆبکەینەوە بگەینە ئەو دەرئەنجامەی باسەکە دەیخواست، کەپێشتر ئێمە لێی بەگومان بووین، بەلأم پێویستمان بەپاڵپشتێکی ئەکادیمی و ئامار هەبوو تاکو دروستی حاڵەتەکانی تێدا

بسەلێنین.. توێژینەوە لەسەر بەشداری سیاسی، بەتایبەتی بەشداری سیاسیانەی ژن، هەڵگری کۆمەڵێك ئاستەنگی خۆیەتی، کەتاکو ئێستاش ناتوانین لەو ئاستەنگیانە خۆمان ڕزگاربکەین، کەزۆرجار دەتوانین لەو خاڵەدا چڕی بکەینەوە، کەکۆمەلگای ئێمە تاکو هەنوکە کۆمەلگایەکی دانپیانەر نییە، واتە ناتوانێت دان بەشتەکاندا بنێت، بەڵکو لەسەر ئاستی نەستی‌و ئەندێشەییدا خاوەنی هەموو تێڕوانینە جوانەکانی ژیانە، بەلاّم هەستی ئازایەتی درکاندنی لەدەست داوە، ترس وەك سیمای یەکەمی ژیانی ئێمە هەموو چالاکیە کۆمەلاّیەتی و ئەقلاّنیەکانی گۆت کردووین، بەڕادەیەك دەتوانین بڵێین کۆمەلگای ئێمە هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو باوەڕەی پێویستی بەوە هەیە، کەخاوەنی ئەقڵی درکاندن یان دانپێدانان بێت، ئەمە جگە لەوەی چەمکی سیاسەت بۆخۆی هەلگری دنیایەك ئاستەنگی خۆیەتی، کەزۆرێك لەزانایانی سۆسیۆلۆژی‌و زانستی سیاسی واتەماشای دەکەن، تێزێکە یان پێکهاتەیەکە ناتوانرێت لەڕووی سۆسیۆلۆژیەوە و وەك زاراوە پێناسەیەکی دروستی بۆ بکرێت، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نهێنیەکانی سیاسەت تەنها لای دەستەبژێری سیاسی دەمێنێتەوە. کەدواتر دێینە سەر ئەم مەسەلەیە، یان ئەوەی ژنانی ئێمە هێشتا لەنێو ترسی کایە کۆمەلاّیەتیەکاندا ناتوانن بەڕاشکاوی دان بەو هەموو حاڵەتەدا بنێن، کەڕووبەڕووی دەبنەوە.

لێرەوە تێدەگەین ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی وا چەندێك بۆ کۆمەلگای ئێمە گرنگ و جێگەی چەندەها ڕستەی گشتگیرمان بۆ دەگرێتەوە. لەبری ئەوەی کارەکان وەك بەرپرسیارێتی تاکەکەس تەماشا بکەین، وەك کارێك یان بەشێك لەئەقڵی کۆمەلاّیەتی تەماشای دەکەین.

بەو پێیەی رێكخراوی پەنا، كارەكانی بۆ بەرەو پێشبردنی بەشداری رەگەزی مێینەیە لەبواری سیاسەت‌و كۆمەڵایەتی‌و چاككردنی ژیانی ژن، هەستمان كرد بوونی دیاردەی بەشداری سیاسی، لەناو كۆمەڵگای ئێمەدا، وەك مەسەلەیەكی ئاشكراو بەرچاوی لێهاتووە، لەبەر ئەوە هەست بە بوونی زۆرێك لە جۆرەكانی بەشداری سیاسی دەكەین، بەڵام بۆ كاری توێژینەوە پێویستە لەسەر مەسەلەكانی ئامار، خوێندنەوەی ئامارو دەركردنی حوكمەكانی لەو ئامارانەوە دەردەچن، قسەبكەین، ئەگەر نا یەكێك لەو حاڵەتانەی بوون بەهۆی ئەنجامدانی ئەم باسە، بوونی بەشداری سیاسیانەی ژن لەناو كایەی هەڵبژاردندا چ وەك پاڵێوراو چ وەك دەنگدەر، كەهەندێك سیمای بەئاشكرا دیارە، بەڵام ئەوەمان بیر نەچێت، بەهۆی ئەوەی كۆمەڵگای ئێمە كۆمەڵگایەكی داخراوە، هەندێك دیاردە هەن بەشاراوەیی دەمێننەوە، لەبەرئەوەی قسەكردن لەسەریان چ لەڕوی كۆمەڵایەتیەوە، چ لەڕوی یاسایشەوە، بەمەسەلە قەدەغەكراوەكان ناودێر كراوە.

ناكرێت ئێمە لەكۆمەڵگایەكی لەو جۆرەدا بژین، كەتوندوتیژی ئۆتۆكراتی لەوپەڕیدا بێت، هەست بەبوونی لاوازی بەشداری سیاسی بۆ ژن نەكەین، جۆری پەیوەندی نێوان مرۆڤەكان لەسەر سڕینەوەی ئەوی تر دامەزرابێت، سڕینەوەیەك زۆر جار بەهەند وەرینەگرین لەبەرئەوەی لەچاو هەندێك سڕینەوەی تردا ئەژمار ناكرێت، وەك نەبوونی ئازادی هاتنە دەرەوەی ڕەگەزی مێینە بۆ دەرەوەی ماڵ، بوونی رێژەو ئاماری زەبەلاحی نەخوێندەواری، كەدەبن بەهۆكاری ناهوشیاری، بەتایبەتی نەخوێندەواری لەناو ڕەگەزی مێینەدا، هەروەها چەپاندنی هەموو حەزەكانی تاك، كە بەهۆیەوە هەموو هیواكانمان خەفە بكرێن، یان ئەوەی ئازاد نەبین لەهەڵبژاردندا، ئەمانە هەموو ئاستی بەشداریكردن

لاواز دەكات، دەتوانین ڕەهەندی جیاجیای بدەینێ، یان بەشێوازی جیاواز بـیری لێبكەینـەوە، بـەڵام ئێمـە هەسـتمان كـرد زیـاد لەیـەك ئاسـت بـۆ كەمكردنەوەی بەشداری سیاسی هەیە، زیاد لەیەك شێواز بۆ ئەم حاڵەتە لە كۆمەڵگای ئێمـەدا هەیـە، بۆیـە ئەنجامـدانی ئـەم توێژینەوەیـەمان بـە زەرورەت زانی، بۆ ئەوەی ئاست و شێوازەكان دیاری بكەین.

## گـــــــــــــــرنگی تـــوێژینەوە :-

ئـەم توێژینەوەیـە، بـەرەو ئـەو تێگەیـشتنە دەمانبـات، چ جۆرێـك لەبەشـداری سیاسـی لـەناو کۆمـەڵگای ئێمـەدا بـوونی هەیـە، ئایـا ئـەم بەشـدارییە بەرجەسـتە یـان هەسـتپێکراوەو لـەچ ئاسـتێکدایە، ئەمـە جگەلەوەی دەبێت ئاماژەش بەوە بدەین ئێمـە چۆن لەبەشـداری سیاسـی تێدەگـەین و چـی بەبەشـداری ئـەژمار دەکـەین. ئایـا ئـەو پێناسـە جیهانیانـەی بۆئـەم حاڵەتـە هـەن، بەسـەر پێکهاتـەکانی ئـەم جـۆرەی ئێمەشدا دەسەپێت.

یـان ئێمـە خـاوەنی تێگەیـشتنی خۆمـانین بـۆ بەشـداری سیاسـی. لەبەرئـەوەی وەلانـانی ژن لەهـەموو کایـەکانی کۆمـەڵگادا، لای ئێمـە مـۆرکێکی دامـەزراو یـان ئۆتۆکراتیانـەی هەیـەو خـاوەنی پێـشینەیەکی میتیانەیە, لەبەر ئەوە زۆرجار جیاکردنەوە یان دیـاریکردنی حاڵەتەکە, وەك نادیـاری لێـدێت, لەبەرئـەوەی ئۆتۆکراتیـەتی حاڵەتەکـە بـەرەو بەڕەمزی کردنی یان شاردنەوەی بەشداریکردنی سیاسـیانەی ژنـی لـەناو هـەموو کایەکانـدا دەمانبـات، توێژەرەوەیـەك زۆر ورد نـەبێت، ئەسـتەمە بتوانێت حاڵەتەکان لەیەکتری جیا بکاتەوە، یان لەڕووی زەمەنەوە تـەنها لەڕاستای ئەو چرکەساتەدا خوێندنەوەی بـۆ بکـات، کـە هەیـەتی، لێـرەدا ئەگـەر وەك زەمـەن تەماشـای بـۆ بکـەین، تـەنها لـەناو ڕاسـتای ئـەو چرکەسـاتەی توێژینەوەکـەی بـۆ کـراوە، هـەموو دیاردەکـان بخوێنینـەوە، دەکەوینە ناو ئاستەنگی گەورەوە.

کاتێك دیاردەیـەك دەخوێنینـەوە، سـەرەتا، بەرلـەوەی دەست بکـەین بەهـەرکارێك، دەبێـت ئامـاژەی بـوونی ئـەو حاڵەتـەمان لابێـت، ئەگـەر بمانـەوێت خوێندنەوەیەکی میتۆدلۆژی یان زانستی بۆ دیاردەی بەشداری

سیاسی بکەین، پێویستە، ئەو دەرهاویشتانە بەهەند وەربگرین کە لەنێو کایەی کۆمەلأیەتیدا بوونیان هەیە، ئێمە کاتێك دەستمان بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەکەمان برد، کۆمەلێك ئاماژە هەبوون، دەستنیشانی بوونی بەشداری سیاسی ژنی لەناو کایەی کۆمەلأیەتیدا دەکرد، کەئێمە تەنها لەسەر بەشداریکردنی ژن لەسیاسەتداو، لەناو ئەویشدا بەشداریکردنی ژنان لەناو هەلبژاردندا توێژینەوەمان کردووە، کاتێك هەموو دیاردە کۆمەلأیەتیەکان بەرەو ئەو ئاقارە دەچن، کەحالەتەکان لەدیاردەیەکی شاراوەوە بۆ دیاردەیەکی ئاشکراکراو بگۆڕدرێن، پێویستە لێرەدا هەلوێستە لەسەر ئەم حالەتە بکرێت و بیر لەوە بکرێتەوە، چۆن هەموو ئەو ڕووداوانەی لەو دیاردە نوێیانە یان ئاشکرا کراوانەوە دەردەکەون خوێندنەوەی بۆ بکرێت. واتە لەسیاقی بیرکردنەوەی میتایی بۆ سیاقی بیرکردنەوەی مەعریفی بگوازینەوە. لەوێدا بیر لەوە بکەینەوە بە چ شێوەیەك دەتوانین قسەیەك بکەین، هەم خاوەنی بەلگەو پالپشتی زانستی بێت، هەم لەسەر ئاستی کۆمەلأیەتی، وابکات بیرکردنەوەیەك بۆ دۆزینەوەی چارەسەرەکان، یان ڕێگا چارەیەك بۆ کەمکردنەوەی ئەم دیاردەیە بدۆزێتەوە. جگە لەهەست کردن بەبوونی بەشداری سیاسیانەی ژنان، چ هۆکارێکی تر وای لەئێمە کرد، بەشداری ژنان لەناو هەلبژاردندا بکەین بەسەرچاوەی توێژینەوەیەك؟ ئایا تەنها حەزێکە بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە؟ یان هۆکاری ترهەن؟. وەك ئاماژەمان پێدا بەشدارینەکردنی ژنان خاوەنی دنیایەك ئاراستەی ئایدیایی و میتایی و مێژوویی و کۆمەلأیەتیە، هەروەها کۆمەلگای ئێمە خاوەنی هێزی داخرانێکی ئۆتۆکراتی و کەلتوریە بەسەر خۆیدا، هەموو ئەمانە وای کردووە ئاستی قسەکردن لەسەر دیاردەکان لەوپەڕی لاوازیدا بێت، یان هێشتا ئەقلأنیەتی کۆمەلأیەتی نەیتوانیبێت باوەڕ بەوە بهێنێت مرۆڤ

خاوەنی ئیرادەو تواناو ئازادی خودی و بیرکردنەوەی خۆیەتی، ئەم قسە نەکردنە لەسەر ئاستی کۆمەلآیەتی بۆ نێو کایە فکری و زانستی و سستماتیکەکانیش گوازراوەتەوە، بەتایبەتی ئێمە هێندە خاوەنی سستەمێکی زارەکین لەجۆری ژیانماندا، هێندە دیکۆمینتاری نین، ئەمەش وای کردووە ئاستی توێژینەوەی زانستی بە شێوەیەك بێت، کەمترین بوون بۆ قسەکردنەکانی خۆی دروست بکات، بەڕادەیەکە کۆمەڵگایەکی وەك ئێمە نەتوانێت هەست بەبوونی بیرکردنەوەی جیاواز بکاتو هەموو ئەوانەی بەدەست هاتوون، وەك قەدەر تەماشا بکاتو نەتوانێت گۆڕانکاری تێدا دروست بکات، کاتێك لەناو کایەیەکی ئاوادا دەتەوێت قسە لەسەر دیاردەکان بکەیت، ئەستەمە بتوانین مەسەلەکان بەڕادەیەکی زانستی دابنێین، ئەگەر هەوڵنەدەین لەدەرەوەی ئەو کایە باوە، بواری تر بۆ ئاماژەپێدان نەدۆزینەوە، ئێمە هەوڵماندا، بوارێك بۆئەو کارە فەراهەم بکەین، کەکەمترین کاری تێدا کراوە، ئەویش ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی مەیدانییە، کەتاکو ئێستا توێژینەوەی مەیدانی لەسەر بنەما زانستیەکانی توێژینەوە لای ئێمە زۆر لاوازە، یان ئەوانەشی هەن کەمتر دەچنە خانەی ئەو حاڵەتەوە، کەبتوانین پشتی پێ ببەستین، ئەمە جگە لەوەی توێژینەوە مەیدانیەکەی ئێمە سنووری مرۆییەکەی زۆر دیاریکراو بوو، تەنها ژنی گرتووەتەوە کەتەمەنیان لەسەرو هەژدەساڵەوەیە گرتووەتەوە، تاکو لەو ڕێگەیەوە ئەوەمان بۆ ئاشکرا بێت ئایا ئاستی بەشداری ژنان لەسیاسەتدا لای ئێمە بەرزە یان نزمە، هەرکامیان دەرچێت، ئێمە لەهۆکارەکانی دەکۆڵینەوە، تاکو دواجار هەمووومان هەوڵ بدەین ئەم دیاردەیە لەسەر هەموو ئاستەکانی بەرەو بەرفراوانی بەشداری بەرین، هەوڵبدەین دیاردەکە لەبری شاردنەوە بەرەو ئاشکراکردن بەرین پاشان کار بۆ ئەوە بکەین، چۆن ڕێگا چارەکان

لەسەر ئاستی كۆمەڵایەتی و دەوڵەت دیاری بكەین، تاكو دەوڵەت پرۆگرامی خۆی بۆ چاككردنی ئەو ڕەوشانە هەبێت، ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیەی ئێمە لە و پێداویستیە گرنگانەوە هاتووە، كە هەستمان بەبوونی كەموكورتی كردووە، پێویستمان بەوە هەیە، قسەی لەسەر بكەین، هەروەها لە كۆمەڵگایەكی وا توندوتیژدا، نەبوونی توێژینەوە لەسەر دیاردەی بەشداریكردنی سیاسیانەی ژن، هەڵگری دنیایەك شیكردنەوەیە، هەندێك جار لە كۆمەڵگای هاوچەرخدا هەندێك مەسەلە بەبەشداری حساب دەكرێت، لای ئێمە بەهیچ كلۆجێك ناخوێنرێتەوە، ئەمە جگە لەوەی ژن لەكۆمەڵگای ئێمە حسابی ڕەگەزێكی لاوازی بۆ دەكرێت و وەك بەشێك لەخواری پیاو تەماشای كراوە، ئەگەر ڕاستی بكەینەوە دەشكێت، دەستی لێبدەین تووشی ئازار دێت، واتە ژن بونەوەرێك نییە، خاوەنی هێزو ئیرادەی ئازادو تایبەتی خۆی بێت، ئەم حاڵەتە وای كردووە ئەم مەسەلانە وەك خۆی ماونەتەوەو كەمترین دەستكاری ئەم ڕیتمە تەقلیدیە كراوەو هەروەك خۆی ماوەتەوە، كەمترین حسابی مرۆیی بۆ ژن كراوە.

، بەڵام بەشداریكردنی سیاسی بۆ ژن بۆخۆی چییە؟ ئەم پرسیارە هەڵدەگرین و لەبەشی دووەمدا، چوارچێوەی تیۆری بەشداریكردنی سیاسیانەی ژن لەهەڵبژردندا دیاری دەكەین.

## ئامانجی توێژینەوەکە:

لەم توێژینەوەیەدا هەوڵمان داوە, ئەم ئامانجانە بەدی بهێنین:

1- خستنەرووی بەشداریکردنی ژنانی کەرکوك لەسەر بنەمای گۆڕاوەکانی:

★ تەمەن: ( 18-23 )، (24-39 ), ( 30-35 ), ( 36-40 ) , (41-46 ) , (47 ساڵو سەروتر ) .

★ئاستی خوێندەواری ( نەخوێندەوار، خوێندەوار، سەرەتایی، ناوەندی، ئامادەیی، پەیمانگاو زانکۆ )

★ ئاستی باری خێزانی (کچ، ژن، بێوەژن).

★ئاستی نیشتەجێبوون: سەنتەری شار، قەزا، ناحیە، گوند.

2-بەراوردکردنی ئاستی بەشداریکردن لەهەموو جێگرەکانی دامانبوو..

## سنوری توێژینەوە:

ئەم توێژینەوەیە سەرجەم ئەو ژنانو کچو بێوەژنانەی لەخۆ گرتووە کە دانیشتووی شاری کەرکوكو گوندو قەزاو ناحیەکانیدا دەژین لەماوەی 2006/2/3 بۆ 2006/2/20 .

**دیاریکردنی چەمکەکان:**

1- بەشداری سیاسی

1- بەشداری سیاسی لەهەر کۆمەڵگایەك دەرئەنجامی کۆتایی کۆمەڵێك هۆکاری کۆمەڵایەتیو ئابوریو مەعریفیو رۆشنبیریو سیاسیو ئاکارییە، کەدیاریکردنی لەبونیادی کۆمەلگای ناوبراوو سستمی سیاسیو سیماو ئامرازەکانی کارکردنی بەشداریدەکات، هەروەها شێوەی پەیوەندی سیاسیو کۆمەڵایەتیی دیاری دەکات، هەروەها چۆنەیەتی گونجاندنی لەگەڵ بنەمای بەشداری، کەبۆتە سیمایەکی سەرەکی لەناو کۆمەلگا مەدەنیە نوێیەکاندا.(ئەنتەرنێت، 2006).

2- سێ پێناسەی سەرەکی هەن بۆ بەشداری سیاسی. (نیوف، 2006، ئەنتەرنێت).

أ- مانای بەرتەسکی: هەموو ئەو کردارو چالاکیانەی رێگەپێدراون، کەلەناو چوارچێوەی رژێمی بالآدەستدا بێت یان رژێمی سیاسی لەسەر حوکم.

ب- مانا بەرفراوانەکەی: لێرەدا کردارەکان رێکخراونو لەدەروەی کارو ئەرکەکانی حکومەتن، بەلآم چاوەڕێی رەزامەندیو قبوڵکردنی حکومەت دەکەن

ت- مانا تەواو بەرفراوانەکەی: لەبواری هەموو ئەو کارو چالاکیو بەشداریانەی ئامانجی هەرچیەك بێت، کەئەبێت حکومەت وەڵامی بداتەوە.

3- مەسەلەی بەشداری سیاسی ژنان لەکاری سیاسیدا تاکو ئێستا کەمو کورتی پێوە دیارە، لەلایەن پارتە سیاسیەکانەوە

گرنگی ته‌واوی پێنه‌دراوه، هه‌روه‌ها له‌لایه‌ن حکومه‌ته‌کانیشه‌وه، ئه‌ویش به‌هۆی ئه‌و بارودۆخه سیاسی‌و کۆمه‌ڵایه‌تییه باوه‌ی له‌ناو کۆمه‌ڵگا ته‌قلیدیه‌کاندا هه‌ن، بۆ ئه‌وه‌ی گرنگی به‌م حاڵه‌ته بده‌ین ئه‌بێت، په‌ره به‌به‌شداری سیاسی ژنان له‌بواری سیاسه‌تدا بده‌ین، ئه‌ویش به‌به‌شداریان له‌رێکخراوه‌کان‌و پارته سیاسیه‌کان‌و گروپه کۆمه‌ڵایه‌تییه‌کان، که‌ده‌بێته ئاماژه‌یه‌کی کۆمه‌ڵگای په‌ره‌سه‌ندوو، که‌ئه‌مه هاوکاری کردنه‌وه‌ی رێگا له‌به‌رده‌م ژناندا ده‌کات بۆ ئه‌وه‌ی رۆڵی خۆیان به‌شێوه‌یه‌کی ئه‌کتیف بگێڕن، هه‌روه‌ها بوونی یاسای مۆدێرن بۆ ئه‌وه‌ی مافه سه‌رتایی‌و مه‌شروعه‌کانی به‌ده‌ست بهێنێت، له‌وانه ئازادی‌و یه‌کسانی له‌به‌رامبه‌ر پیاودا(صالح، 2006: ئه‌نته‌رنێت)

به‌شداری سیاسی بنه‌مایه‌کی دیموکراتییه، له‌گرنگترین بنه‌ماکانی ده‌وڵه‌تی نیشتمانی نوێیه، که‌ده‌توانین به‌هۆیه‌وه سستمه نیشتمانیه دیموکراتییه‌کان جیابکه‌ینه‌وه، که‌له‌سه‌ر بنه‌مای هاوڵاتیبوون‌و یه‌کسانی له‌نێوان ئه‌رك‌و مافدا دامه‌زراوه، هه‌روه‌ها له‌سستمه سه‌رکوتگه‌ریه، تۆتالیتاریه‌کان، که‌هه‌موو ده‌سه‌ڵاتێکیان بۆ خۆیان قۆرغ کردووه، بنه‌مایه‌که جیاوازیه‌ك له‌نێوان سستمی نیشتمانی دیموکراتی، که‌باوه‌ڕی جیاوازی‌و فره شێوه‌یی هه‌یه، هه‌روه‌ها به‌دژه دیالۆگ، له‌گه‌ڵ سستمه گشتگیره‌کان یان سته‌مکارانه‌کاندا جیای ده‌کاته‌وه، بنه‌مایه‌کی سیاسی‌و ئاکارییه، جیاوازی له‌نێوان ئازادی‌و سته‌مکاریدا ده‌کات.(ئه‌نته‌رنێت، 2006: 2)

## پێناسەی ئیجرائی بەشداری سیاسی

لـەم توێژینەوەیــەدا، بەشــداری سیاســی لەڕێگــەی ئــەو بڕگــەو پرسیارانەوە دەستنیشان دەکەین‌و دەیناسێنین، کەهەریەك لە ئەندامانی سـامپڵی توێژینــەوە، وەڵامیــان داوەتــەوە، کــە وەڵامــەکان لەپرۆســەیەکی جیاکردنەوەی ڕێژەکاندا، ڕێژەی سەدیدان بۆ دەرهێنـراوە، لـەوێوە ئێمـە ئەو ئامانجانەمان دەست دەکەوێت، کە توێژینەوەکە بۆخـۆی دەستنیـشان کـردوە، کـە دواتـر لـەوە تێدەگـەین بـەپێی پێکهاتـەی کۆمەڵایـەتی ئێمـە بەشداری سیاسی مانای چی دەگەیەنێت.

## 2/ هەڵبژاردن

1- بنــەمای ســستمی دیموکراســیە، بریتیــە لــەوەرگرتنی دەســەڵات بەگوێرەی خواستی گـەل یـان جـەماوەر، دوور -لەبـەکارهێنانی هێز،واتـە بەبێ پـەیڕەوی کـردن لەسـستمی دەستبەسـەرداگرتن، ئـەویش لەڕێگـەی کودەتا یان شۆڕشەوە، کۆمـەڵێك دەس بگرێـت بەسـەر حوکمـدا لەڕێگـەی میراتەوە لەباوکەوە دەسەڵات دەستاو دەست دەکات... سستمی هەڵبژاردن گەڕانەوەیـە بـۆ مـەیل‌و ئـیرادەی گـەل لـەدانانی سـەردار یـان سـەرۆکدا، ئـــەویش لەڕێگـــەی پرســـکردن‌و بەســـەرکردنەوەو وەرگرتنـــی ڕاو بەشـداریکردنی لەسـەرجەمی پرۆسـە سیاسـیەکانی دەوڵەتـدا(مەجیـد، 2005:139).

2- ململانێی هەڵبژاردن بەبەکارهێنلنی دوا تەکنیك‌و داهێنانی نـوێی قەناعــەت پێکــردن‌و پەیوەنــدی کاریگــەر، بــەردەوام دەگــۆڕێن‌و بــەرو پێـشەوە دەچـن، لـەم دیـدەوە حیزبـەکان وەك ڕێکخـراوە بازرگانیـەکان تەماشا دەکرێن، کەبەدوای پڕوپاگەندەکردن بۆ کەل‌وپەل‌و بازرگانییانـە

تەماشا دەکرێن... یەکێکیان بەدوای وەدەستخستنی دەنگەوەیەو ئەوی تر بەدوای فرۆشتنی بەرهەماکانەیوەیە(کاڤاك،2005: 17).

## پێناسەی ئیجرائی هەڵبژاردن:

سەرجەم توێژینەوەکە لەسەر خودی ئەو بەشدارییەی ژن کراوە لەهەڵبژاردندا، بەتایبەتی ئەوانەی لەناو شاری کەرکوکدا دەژین، وەرگرتنی ئەم سامپڵە، وامان لێدەکات بیر لەوە بکەینەوە چۆن بتوانین بەشداری سیاسی ژنان دیاری بکەین، لەتوێژینەوەکەدا ژن وەك رەگەزی سەرەکی وەرگیراوە، واتە لەم توێژینەوەیەدا، کچو ژنی تەلاقدراوو بێوەژنمان بەهەمان مانا وەرگرتووە، بەڵام بەجیاوازی لەیەك حاڵەتدا.

## 3/ جیاکاری دژی ژن:

1- جیاکاری دژی ژن، هەموو جیاکردنەوەو دوورخستنەوە یان کۆتو بەندکردنی ژنە، کەلەسەر بنەمای رەگەز بێت، لەکاریگەری یان مەبەستی دابەزاندنی یان تەوهین کردن بێت بەژن‌و بەمافەکانی مرۆڤو ئازادییە بنەڕەتیەکان، لەبوارەکانی سیاسەتو ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و مەدەنی، یان لەهەر مەیدانێکی تردا بێت، یان تەوهینکردن‌و دابەزاندنی سوود وەرگرتن لەو مافانە یان مومارەسەکردنی، ئەویش بەدەر لەحاڵەتی هاوسەریەتی‌و لەسەر بنەمای یەکسانی نێوان ژن‌و پیاو(امم المتحده، 1981: المادە الاولی).

## پێناسەی ئیجرائی جیاكاری دژی ژن:

جیاكـاری دژی ژن لـەم توێژینەوەیـەدا، لەهـەمان تێروانیینـەوە سەرچاوەی گرتـووە، كـە رەگـەزی پـەراوێزخراوی نـاو كۆمـەڵگای ئێمـە پێكدەهێنێت، هەروەها دیاردەی بەشداریكردنی سیاسی لەناو نێوەنـدی رۆشـنبیریدا زۆرجـار بەشـێوازی جیـاواز قـسەی لێـدەكرا، لەبـەر ئـەوە بەشداری سیاسیمان كردە سەرچاوەی باسەكەمان، تا لەوە تێبگـەین ژن لەم دەڤـەرەدا تـاچ ئاسـتێك بـوونی خـۆی لـەناو پێكهاتـەو پێناسـەكاندا دیـاری كـردووە، لـەم سـۆنگەیەوە ئـەم توێژینەوەیـەمان بـۆ بەشـداری سیاسی ژن ئەنجام دا.

## ئایا ئاینده‌ی سیاسی ئه‌م وڵاته‌ به‌ره‌و دیموکراسی ده‌چێت؟

به‌ر له‌وه‌ی قسه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ بکه‌ین، كه‌ ئاینده‌ی عێراق به‌ره‌و دیموکراسی ده‌چێت ده‌بێت كه‌مێك بگه‌ڕێینه‌وه‌ دواوه‌و سه‌یری شێوازی دروست بوونی ده‌وڵه‌تی عێراق‌و پێكهاته‌ سیاسی‌و كۆمه‌ڵایه‌تیه‌كان بكه‌ین‌و بزانین تا چه‌ند باری سیاسی‌و كۆمه‌ڵایه‌تی عێراق یارمه‌تی ده‌ربووه‌ بۆ ئه‌وه‌ی بنه‌ماكانی دیموکراسی چه‌كه‌ره‌ بكات‌و بڵاوبێته‌وه‌، تا ئه‌و پێكهاتانه‌ نه‌ناسین‌و ده‌ست نیشانی فاكته‌ره‌كانی نه‌كه‌ین ناتوانین ده‌رئه‌نجامێكی ئه‌وتۆ، له‌باره‌ی دیموکراسی بوونی عێراق، یاخود نه‌بوونی به‌ده‌سن بهێنین، چونكه‌ هه‌ر كۆمه‌ڵگایه‌ك به‌بێ ده‌ست نیشان كردنی پێك هاته‌ كۆمه‌ڵایه‌تی‌و سیاسیه‌كانی له‌ قۆناغه‌كانی دروست بوونییه‌وه‌ نه‌ناسین ناتوانین كاركردو جۆری سیستمی سیاسی‌و كۆمه‌ڵایه‌تی بناسین، به‌نه‌ناسینی جۆری پێك هاته‌كان‌و ده‌سه‌ڵاته‌كانیش ناتوانین بڕیار له‌سه‌ر هیچ پێناسه‌یه‌كی دیاری كراو بده‌ین.

كۆمه‌ڵگای عێراق، كۆمه‌ڵگایه‌كی داخراوی سونه‌تی ئاینی بووه‌و به‌درێژایی مێژوو هه‌تا دروست كردنی یه‌كه‌مین ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر ده‌ستی به‌ریتانیا، پیك هاته‌ی سیاسی‌و كۆمه‌ڵایه‌تی عێراق به‌سه‌ر خێڵ‌و ناوچه‌و تیرو مه‌زهه‌ب گه‌رایی دابه‌ش بوو، هه‌ر یه‌كێكیكش له‌و پێك هاتانه‌ خاوه‌نی خه‌سڵه‌ت‌و تایبه‌تمه‌ندی خۆیان بوون‌و هه‌ڵگری یه‌ك دنیا جیاوازیش بوون له‌گه‌ڵ یه‌كدی‌و تا ئه‌و په‌ڕی ئاستی توندو تیژیان به‌رامبه‌ره‌ یه‌كدی به‌كارهێناوه‌و كاری ڕۆژانه‌یان شه‌ڕو تاڵان‌و داگیركردن‌و ده‌ست درێژی بووه‌ بۆ سه‌ر یه‌كتری‌و هیچ كات گوێیان به‌ژیانی لێبورده‌یی‌و گوێ له‌یه‌كتر گرتن نه‌داوه‌، بۆیه‌ ده‌بینین خێڵه‌كانی ناو عێراق هه‌ر یه‌كه‌یان به‌جۆرێك له‌ جۆره‌كان دژی هه‌ر

جۆرە ئازادیو مافێك بووە بۆ خێڵەکانی ترو بەردەوام ئەوە لە سایکۆژیەتیاندا کاری کردوە کە چۆن دەسەڵاتی خۆی زیاد بکاتو داگیر بکات، بۆ ئەم کارەش لەشەڕی ڕۆژانەو داگیرکاریو وێران کاری دا بووە، بەبێ گوێ دانە هیچ قیەمیکی مرۆڤانەو بەدەوام لەسەنگەر گرتن دا بووە، لەدژی خێڵو تایفەو مەزهەبەکانی تر، ئەمەش تاکی عێراقی گەیاندووە بە فەلسەفەی دڵ ڕەقیو خوین ڕشتنو ئاسایی ترین کار لەلای تاکی عێراقی خوێن ڕشتنو لەناوبردن بووەو ئەو سیمایەش بەئاسانی بەمێژووی خوێناوی عێراقەوە دەبینرێتو کاروکردەکانی خێڵو ئایینە جیاوازەکان لە عێراقداو شەڕو کارولکاریو دەست درێژیەکانیان بۆ سەر یەکترو ڕێژەی قوربانیەکانی دەستی ئەو عەقڵیەتە، لە کۆنەوە تا ئەمرۆ درێژەی هەیەو کار لەناو سایکۆلۆژیەتی پیك هاتە جیاوازەکانی عێراق دەکات.

پەیوەست بوونی تاکی عێراقی بەسایکۆلۆژیەتی دڵ ڕەقیو فەلسەفەی خوێن، لەخۆڕاو لەخۆوە نییە، بەڵکو ئەوە دەرئەنجامی ئەو کەلتورە دوورو درێژەی کۆی عەقڵیەتی عەرەبی بیابانە، کە لەڕابوردوداو خێڵو تیرەکانی عەرەبی دورگەی عەرەبی شەهامەتو پیاوەتی لەلایەن داگیرکردنو تالان کردنو دەست بەسەراگرتنی یەکترو شەڕی هەمە ڕۆژە، ئەوە گەورەترین سیفەتی عەرەب بووە بەگشتیو بەر لەهاتنی ئیسلامو دوای هاتنی ئیسلامیش بەجۆرێکی تر ئەو سایکلۆژیەتەی لەلای تاکی عێراقی قوڵ کردوەو بگرە هاندەریش بوو بۆ ئەوەی زیاتر عەقڵیەتی داگیرکاریو تالانکردن پەرەبسێنێو ناکۆکی نێوان خێڵەکانی عەرەب زیاتر بکاتو فەلسەفەی خوێن ڕشتنو دڵ ڕەقی پەرەی زیاتر بسێنێ، ڕەوشتی داگیرکاریو تالانکردن لەلای عەرەب بەگشتیو عەرەبی عێراقیش بەتایبەتی فەلسەفەی مانەوە عەقڵیەت

بووەو بەردەوام ئەو سایكلۆژیەتە گەشێنراوەتەوەو كاری لەسەر كراوە، بۆیە پەلاماری خێڵەكان بۆ سەر یەكتری‌و شەڕی نێوان مەزرهە جیاوازەكانی ناو یەك ئایین مێژوویەیكی خوێناوی زۆری هەیە لەلایە هەر دوو مەزهەبی (شیعەو سونە) لەتەواوی ناوچە عەرەب نشنیەكانەوە بەعێراقیشەوە، سەرباری ئەوەی عەرەب هەر لە كۆنەوە خاوەنی عەقڵیەتی شەڕانگێزی‌و نەفی كردنەوەی ئەوی تر بووەو هەرگیز باوەڕیان بەگفتوگۆكردن نەبووەو خەریكی كاری سڕینەوەی یەكتری بوون‌و لەو پێناوەش دا دەریایەك خوێن ڕژێنراوە، بۆیە خێڵەكانی عەرەب، بەردەوام لەخۆ ئامادەكردن‌و خۆ پڕ چەك كردن دا بوون لەترسی یەكتری‌و هەنگاوانیش بۆ داگیركردنی یەكترو تاڵان كردنی یەكتری، چونكە عەرەب لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو ژیانی ڕۆژانەی بەدەسكەوتی شەڕی ڕۆژانە دابین بكات، هەڵبەتە ئیسلامیش وەك لەپێشتر ئاماژەم بۆ كرد دەروازەیەكی تر بوو بۆ پڕكردنی سایكلۆژیەتی تاكی عەرەبی بۆ داگیركردن‌و تاڵان كردن، بەناوی بڵاوبوونەوەی ئایین‌و پەیداكردنی دەسەڵاتی ڕەهاو دامەزراندنی ئیمپراتۆریەت، داگیركاریەكانی ئیسلام بۆ ناوچەكان شایەدی ئەو ڕاستیەن.

دیارە تاكی عێراقیش پەروەردی ئەو عەقڵیەت‌و فەلسەفەیە، كە دەبێت بەردەوام لەهەوڵی داگیركردن‌و تاڵانكردن دا بێت‌و ئەو ڕەوشەش لە عێراق دا هەزاران ساڵی خایاندوەو نەوە دوای نەوە بەو شێوە عەقڵیەتە پەروەردە كراوەو بۆ نەوەكانی دواتر گواستراوەتەوەو بوار نەدراوە لێبوردەیی لە عەقڵیەتی تاكی عێراقی دا گەشە بكات‌و لێك نزیك بوونەوەو پێكەوە ژیان، عەقڵیەتی شەڕانگێزو كوشت‌و بڕو كاولكاری بسڕێتەوە، بۆیە كۆمەڵگای عێراقی خاوەنی گەورەترین شەڕی خوێناوی ناو خێڵ‌و پێك هاتە كۆمەڵایەتی‌و ئایینی‌یەكانەوەو ئەو

شەڕانەش بە درێژایی مێژوو چەند بارە بوونەتەوەو قوربانیەکانیش ڕوو لەزیادو زیاتر کردووەو ناکۆکی نێوان ئەو پێك هاتانەش قوڵ ترو خوێناوی تر بووە، ئەو ڕەوشەی ناو پێك هاتەکانی کۆمەڵگای عێراق وای کردبوو، کە هیچ کاتێك نەتوانن بوار بۆ هوشیاری لەبارەی ماف‌و ئازادیەکانی یەکتر بکەنەوەو هەوڵی ئەوە بدەن کە فێری ژیانی دوور لە ڕق‌و شەڕ بن.. بوونی ئەو سایکلۆژیەتە وای کردبوو، بەردەوام ڕەوشی عێراق ئاڵۆزو نالەبار بێت‌و شەڕی سڕینەوەی یەکتری بەردەوام بێت‌و نەتوانن دەسەڵات‌و دەوڵەتێکی مۆدێرن پێك بهێنن‌و خۆیان لەسەر ژیانی مەدەنی ڕابهێنن‌و نەوەکان بە عەقڵیەتی قبوڵ کردنی ئەویتر بەهەموو جیاوازیە ئایینی‌و مەزهەبیەکانەوە قبوڵ بکەن، هەر بۆیە کاتێك یەکەمین دەوڵەت کە لەسەر دەستی بەریتانیا لە عێراق دروست دەکرێت، ئەو دەوڵەتە دورست دەکرێت‌و هیچ بنەمایەکی بەشداری کردنی هاوڵاتیانی عێراقی تیا نیەیەو، لەماوەیەکی کورت دا شەڕی دژی ئەو دەسەڵاتە دەست پێدەکات، چونکە تاکی عێراقی تاکێکی شەڕانگێزو دڵ ڕەقەو ئامادەی ژیانی پێکەوەیی نیە، شەڕەکان دژی دەسەڵاتی پاشایەتی هەتا ساڵی (1958) دەخایەنێت چەندین شەڕی خوێناوی لەنێوان دەسەڵاتی پاشایەتی‌و ئەوانی تردا ڕوو دەدات‌و هەتا ڕووخانی دەسەڵاتی پاشایەتی، کە مێژووی عێراق شاهیدی ئەوەیە کە چ ڕق‌و دڵ ڕەقیەك لەناو دڵی تاکی عێراقی دا دژی پاشایەتی پەنگی خواردوەتەوەو لەکاتی ڕوخاندنی دا چۆن سوکایەتی بەجەستەی کوژراوەکان کراوەو ئەو سیناریۆیەش لە ڕووخاندی قاسمیەکانیش دووبارە بوەوەو بەهاتنی بەعسیش هەمان سیناریۆ کاری کردوە لەناو عەقڵیەتی تاکی عێراقی‌و بەعس بەو پەڕی دڕندانە کوشت‌و بڕی ئەنجام داوەو پەرەشی بە عەقڵیەتی سڕینەوەو ئەوی تر داوەو شەرعیەتیشی بەخۆی داوە..

کۆمەڵگایەك خاوەنی ئەو عەقڵیەت‌و کەلتورو سایکۆلۆژیەتە بێت، ئایا ئەگەری ئەوەی هەیە ئەوی تر قبوڵ بکات‌و دەست بەرداری شەڕو کوشتن‌و تالآنکاری بێت، ئەمە ئەو پرسیارە گرنگەیە کە دەتوانین لێیەوە قسە لە ئەگەرەکانی دیموکراسی بکەین، چونکە دیموکراسی لە سادەترین پیناسەدا قبوڵ کردنی جیاوازیەکان‌و ئازادیەکانی ئەوی ترە، کۆمەڵگایەك لەسەر ئەو بنەمایە ڕانەهاتبێ، سانا نییە بەرەو دیموکراسی هەنگاو بنێت..

کۆمەڵگای عێراقی هەزاران ساڵە مومارەسەی توندو تیژی‌و دڵ ڕەقی دەکات‌و تائێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە لە خوێن ڕشتن‌و ئازادی دەورنی، سەرباری ئەو هەموو پێشکەوتنەی لەبواری زانست‌و زانیاری‌و تەکنەلۆژیادا ڕووی داوە، کە کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبووە لەسەر کۆی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی‌و گۆڕینی ئاڕاستەی توندوتیژی‌و دڵ ڕەقی، بەلآم ئەو گۆڕانکاریانە کەمترین کاردانەوەی لەلای تاکی عێراقی نەبووەو ئێستاش کۆی ئەو عەقڵیەتی شەڕانگێزی‌و قبوڵ نەکردنی ئەویترو بەکارهێنانی تا ئەو پەڕی توندو تیژی لەناو پێك هاتەکانی کۆمەڵگای عێراق دا ئیش دەکات، تائێستاش شەڕی ئەتنیکی‌و تایفی‌و مەزهەبی لە عێراقدا بەشێوە ناشیرینەکەی بوونی هەیەو کۆی پێك هاتە حزبی‌و ڕێکخراوەیی‌و مەزهەبە جۆراوجۆرەکان شەڕ لەسەر سڕینەوەی یەکتری دەکەن، گەرچی ئێستا ئەو ناکۆکیە خوێناویانە لەچوار چێوەی مۆدێرن تر لە خێڵ بەڕێوە دەچێت، بەلآم بەهەمان عەقڵیەتی خێڵ کار دەکەن‌و هەوڵی سڕینەوەو لەناوبردنی یەکتری دەدەن، بۆیە ئەگەرەکان بۆ بەدیموکراسی بوونی عێراق لەئێستاداو دوای (86) ساڵ لەدروست بوونی یەکەمین دەوڵەت لە عێراق دا ئەگەرێکی لاوازەو بەم عەقڵیەت‌و کەلتورو ڕۆشنبیری شەڕانگێزییەوە.. چونکە تاکی عێراقی تاکێکە

بەردەوام لەنەستی دا هەستی سڕینەوەو لەناوبردن کار دەکات. کۆڕینی ئەو عەقڵەیەتەش کارێکی زۆر زەحمەتە، ئایدیایەك بتوانێت کەلتورێکی هەزاران ساڵە بسڕێتەوە ئەگەر ویستی خودیو پەرۆشی خودی بۆ گۆڕانکاری بوونی نەبێت.

تاکی عێراقی کەمترین ئامادەیی لەخۆنەگرتوە بۆ گۆڕانکاری لە عەقڵیەتو سایکۆلۆژیەتی داو بەردەوام نەوەکان بە کەلتوریو ڕۆشنبیری کۆن دەمەزەرد دەکرێنەوەو کار لەسەر سایکلۆژیەتیان دەکرێو هان دەدرێن بۆ شەڕانگێزیو لەناوبردنی یەکتری، ڕۆژانە مەزهەبە جیاوازەکان نەوەکانیان پەروەردە دەکەن لەسەر ڕەفزکردنەوەی ئەوەی ترو، ئەتنیکە جیاوازەکان کار بۆ لەناوبردنی یەکتری دەکەنو ئەو ڕۆشنبیریە بەنەوەکانیان دەدەنو هیچ ئاماژەیەك بۆ لێبوردەییو پێکەوەژیانو سڕینەوەی عەقڵیەتی فەلسەفەی خوێن کار ناکات.. گەرچی لەدوای پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراقەوە هەزاران ڕێکخراوی کۆمەڵی مەدەنی دروست بوونو ڕێژەی دروست کردنی حزب زۆر فراوان بووە، سێ جار هەڵبژاردن ئەنجام دراوە، بەڵام ناتوانین هیچ یەکێك لەوانە بەسەرەتایەك بەرەو دیموکراسی سەیر بکەین، چونکە زۆرینەی ئەو پێك هاتانەو بەشداری کردنیان لەو پرۆسانەدا، جگە لەڕق لەبەرامبەرو سڕینەوەی بەرامبەر هیچ شتێکی تریان نییە، دوای سێ ساڵ لەو پرۆسەیە ئێستایش گەورەترین خوێن ڕێژی لە عێراقدا ئەنجام دەدرێتو ڕۆژانە مومارەسەی دڵ ڕەقیو خوێن ڕشتن ئەنجام دەددرێتو هیچ یەکێك لەو کارە ناشرینانە دڵی تاکی عێراقی ئازار ناداتو جۆرێك لە گۆڕانکاری بەسەر سایکلۆژیەتیاندا ناهێنێت، کە ئەو هەموو ڕقو خوێن ڕشتنە چی سودێك بە مرۆڤو خەونەکانی دەگەیەنێت.. تائێستاش تاکی عێراقی بەناشیرین ترین شێوە مرۆڤ کوژی ئەنجام

دەدات، کە ئەوە عەقڵیەتی هەزار ساڵ بەر لەئێستایەو تاکی عێراقی گۆڕانی بەسەردا نەهاتوە، لەبەر ئەوەی تاکی عێراقی هەر لە ئەساسەوە باوەڕی بەگۆڕانکاری نییەو دەیەوێت دەست بەهەویەتی شەڕانگێزی خۆیەوە بگرێ‌و کاری لەسەر بکات‌و ڕۆژانە ئەنجام دانی ئەو شێوە شەڕانگێزە لە عێراق دا دووبارە دەبنەوەو تا ئێستا زمانی گفتوگۆکردن زۆر لاوازە، لەبەرامبەری دا زمانی شەڕو سڕینەوەو کوشتن زۆر بەهێزو ئاساییە ، دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی زۆر لاوازن‌و هەندێکی زۆریان هیچ کاریگەریان نییەو هەر لە بنەڕەتیشدا سەر بەو حیزب‌و پێکهاتانەن، کە دژی گۆڕانکاری‌و عەقڵیەتی شەڕانگێزین، بۆیە دەتوانین بڵێن، ئەگەرچی گۆڕانکاری بەرەو دیموکراسی لە عێراق دا زۆر لاوازەو بەم شێوە ژیانەو ممارەسەکردنی سیاسی‌و کۆمەڵایەتییەوە دورین لەوەی بتوانین ڕابێت، یاخود کار بۆ بەدیموکراسی کردنی کۆمەڵگا بکەین، کۆمەڵگایەك تاسەر مۆخ‌و ئێسقان دژی ئازادی‌و مافەکانی ئەوی تر بێت‌و ئامادەی گوێ گرتن نەبێت، چۆن دەتوانێت ژیانی دیموکراسی‌و مەدەنی قبوڵ بکات، کە گرنگترین بنەماکانی ژیانی دیموکراسی قبوڵ کردنی ئەویترو جیازازیەکانە... بوونی دەستووری مەدەنی‌و دەوڵەتی یاسایە، دەوڵەتێك لەسەر بنەمای مافەکانی مرۆڤ‌و قبوڵ کردنی تەواوی بیروڕا ئازادەکان‌و ڕێزگرتن لەسەروەرییەکانی مرۆڤ.. عێراق هیچ یەکێك لەو بنەمایانەی تیا نییەو تا ئێستا هەچ دەستورو دەسەلاتێك هاتبێتە سەر حوکم ئامادە نەبوو جیاوازییەکان قبوڵ بکات‌و بەرگری لەماف‌و سەروەرییەکانی مرۆڤ بکات، بەڵکو ئەو دەسەلاتانە، یان لەسەر بنەمای مەزهەبی، یاخود عرقی دامەزراون‌و کاریشیان بووژاندنەوەی دڵ ڕەقی‌و خوێن ڕشتن بوو، بۆیە هەمیشە دواکەوتونە ئەوە لەژیانی مەدەنی‌و یاسایی، کە پارێزەری مافەکانی هاولاتیان بێت بەبێ جیازازی

ڕەگەزی‌و ئەتنیکی‌و تایفی... دەوڵەتی عێراق بەئێستاشەوە کە خاوەنی فرەییەو لەدەسەلاتو پەرلەمان‌و دەستوری هەیە، بەلام ئەوەی جێگەی قبوڵ کردن نییە جیاوازی ئەتنیکی‌و مەزهەبیەو ڕۆژانە کێشەی ئازادی بیروڕا هەیەو ناکۆکیە مەزهەبیەکانی عێراق لەئاستی خوێن ڕشتن دایەو هیچ جۆرە یاسایەکی مەدەنی بوونی نییەو ڕۆژانە تاکەکانی عێراق دەبنە سوتەمەنی دەستی تیرۆرو قبوڵ نەکردنی ئازادی ئەویتر. ئەم شێوە کارکردنەی تاکی عێراقی دوای ئەو هەموو ساڵە لە ئەزموونی دەوڵەت نەیتوانیوە بچوکترین بنەمای دیموکراسی قبوڵ بکات، کە مافی ئازادی هاولاتیانە بە جیاوازیەکانەوە، بۆیە کۆمەڵگای عێراقی زۆری ماوە بگات بەهەنگاو نانی جدی بەرەو دیموکراسی، چونکە ئەزموونی ئەو هەموو وێرانکاری‌و خوێن ڕشتنە نەیتوانیوە تاکی عێراقی فێری خۆشویستنی ژیانیان بکات، بەڵکو کۆی ئەزموونەکان تاکی عێراقیان فێری ژیانی دڵ ڕەقی کردوەو ئێستاش تاکی عێراقی زۆری حەز لە خوێن ڕشتن‌و تەماشاکردنی خوێنی ڕژاوە، بۆیە لەم جۆرە ژینگەیەدا هەنگاونان بۆ گۆڕانکاری زۆر قورس‌و پڕ لە گرێ‌و گۆڵەو بنەماکانی عەقڵی دیموکراسی لە عێراق دا زۆر لاوازە، بەو مانایەش نا کە هەر هیچ بنەمایەکی عەقڵی دیموکراسی بوونی نییە، بەلام کەمترین بوار لەبەردەم ئەگەری هەنگاونان هەیە بەتایبەت لە ئێستای کۆمەڵگای عێراقدا، کە کێشە سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەلایەتیەکان لە ئەزمەیەکی زۆر قوڵ دایەو ڕۆژانە خوێن ڕشتن ڕوو دەداتو ترس‌و دڵەڕاوکێ سایکلۆلۆژیەتی زۆرینەی تاکەکانی داگیرکردووەو دەسەلات بەشێوەیەکی زۆر نامەدەنییانە ڕووبەڕووی هەر داخوازیەکی هاولاتیان دەوەستێتەو زۆر دژی گۆڕانەو نایەوێت ژیانی گۆڕانکاری قبوڵ بکات، ئێستایش لە عێراق دا حکومەتو دەسەلات لەسەر بنەمای هەڵبژاردنی دیموکراسیانە

پێك نایەت‌و بگرە لەرێگەی ڕێکەوتنی تەیارە جیاوازەکان‌و بۆ بەرژەوەندی خۆیان پێکی دەهێنن، کەئەمەشیان دوورکەوتنەوەیە لە ئەگەری بەرەو دیموکراسی چوون‌و گۆڕانکاری جدی، لەو کەلتورە ناشرینەی کۆمەڵگای عێراقی‌و مەزهەبیش کە ڕێگری جدییە لە بەمەدەنی بوون‌و هەنگاونان بەرەو دیموکراسیەت زۆر بە قوڵی لەناو عەقڵیەت‌و سایکۆلۆژیەتی تاکی عێراقی دا ئیش دەکات‌و لەدەستوریش دا ڕەنگی داوەتەوە، کە دیارە مەزهەب زۆر دژی دیموکراسیەتەو بەرگری لەمانەوەی دەسەڵاتی شمولی‌و کۆیلەکردنی هاوڵاتیان دەکات.. بۆیە ئەگەرەکانی گۆڕانکاری‌و هەنگاونان بەرەو دیموکراسی لەکۆمەڵگای عێراق دا زۆر لاوازەو پێویستی بەکارکردنی زۆر جدی هەیە، تا ئەوەی بتوانرێت دەروازەیەك بدۆزێتەوە، کە عەقڵیەتی چەق بەستوی تاکی عێراقی بشڵەقێنێ بۆ گۆڕانکاری‌و ڕاهێنانیان لەسەر فرەیی‌و ژیانی مەدەنی، کە بنەمای سەرەکییە بەرەو دیموکراسی‌و قبوڵ کردنی یەکتری...

لایەنێکی تری لاوازی تاکی عێراقی لەوەدایە کە ئەزموونی لەژیانی ڕابوردو وەرنەگرتوەو بەردەوام هەڵەکان دووبارە دەکاتەوەو نایەوێت هەنگاو بەرەو گۆڕانکاری بنێت، تا ئەو ئاستەی تاکی عێراقی جۆرێك لە ڕەشبینی‌و بێ دەربەستە بەئاییندەو چارەنوسی خۆی‌و گوێ بەجۆری ژیان‌و دەسەڵات نادات‌و خۆی دوورەپەرێز گرتووەو نایەوێت بەشدارو چالاکی باری ژیان‌و گۆڕانکاری‌و جۆری دەسەڵات بێت، بۆیە تاکی عێراقی لەزۆرترین حاڵەتدا بێ دەنگی هەڵدەبژێرت‌و چاوەڕوانی فەرمان جێبەجێ کردن دەکات، لەکاتێکدا هەنگاونان بەرەو دیموکراسی شەڕی گەورەی لاوانی دەوێت‌و کار بۆ گۆڕین بکات‌و دژی هەموو عەقڵیەتێکی کۆن‌و چەق بەستو، لاوان کاتێك ئەو شەڕە ناکەن بە

دڵنیایی عەقڵیەتی ڕابوردو مانەوەی خۆی مسۆگەر دەکاتو بەو پەڕی توندو تیژیەوە دژی هەموو جۆرە گۆڕانکاریو بەرەو پێش چوونێکەو ناشیەوێت بەئاسانی قبوڵی ژیانی فرەییو ئازادی ئەوی تر بکات... بێ دەربەستی لاوان بەگۆڕانکاری وای کردووە بەردەوام ژیانی سیاسی بەدەستی عەقڵیەتی کۆن خوازییو دژی گۆڕانکاریەوە بێتو بەئارەزووی خۆی مومارەسەی دەسەڵات بکاتو لاوانو گۆڕانکاریەکانیش کۆتو زنجیر بکاتو بەر بەهەموو ئەگەرێکی نوێ بگرێت... ئەو ئەزموون کردنەی عەقڵیەتی کۆنخوازی بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات لە عێراق دا لە (8) ساڵی ڕابوردودا بەو شێوەیە بووەو کاری کردووەو دژی هەموو کرانەوەو گۆڕانکاریەك وەستاوەتەوەو بەردەوام بە عەقڵیەتی کۆن حوکمی ووڵاتی کردوەو ڕووبەڕووی هەموو گۆڕانکاریو هەنگاوە مەدەنیو دیموکراسیەکان وەستاوەتەوە، بۆیە هەنگاونانی جدی بەرەو دیموکراسیەت لاوازو ئیفلیج کردووەو هەر ئەگەرێکی واش هاتبێتە پێش بەتوندترین شێوە سەرکوت کراوە... بەهەر حاڵ ئەگەرەکانی بەدیموکراسی کردنی کۆمەڵگای عێراقی فورسەتی لەبەردەم دا هەیە، بەڵام تا چەند تاکی عێراقی دەست بەرداری ئەزموونی تاڵی ڕابوردوی پڕ لە خوێن ڕشتن دەبێتو گۆڕانکاریەکان قبوڵ دەکاتو بەگیانی سەردەمەوە دێتە ناو کارکردنی سیاسیو کۆی پێك هاتەکانی نوێ دەکاتەوە دەیان گۆڕێت، کە ئەمەیان کاری ئەم نەوەیەیە کەلەسەردەمی تەکنەلۆژیای نوێو جیهانگیریدا دەژێتو ئاشنایەتی لەگەڵ کۆی فکرو مەفاهیمە نوێکان هەیەو ڕۆژانە لەمسی تەکنەلۆژیای نوێ (زانیاریو پەیوەندی کردن) دەکاتو لە کورترین ماوەدا زۆرترین زانیاری لەدوورترین شوێنی دنیا بەدەست دەهێنێت، بۆیە ئەم نەوەیە دەتوانێت هەنگاوی جدی هەڵگرێت بەرەو بەدیموکراسی کردنی کۆمەڵگاو گۆڕینی

ئاراسته باوه‌كانی كاركردنی نه‌وه‌كانی پێشوو، كه دیاره له‌ئێستای كۆمه‌ڵگای عێراق دا كاتێكی گونجاوه بۆ ئه‌و شێوازه كاركردنه‌و گۆڕانكارییه‌كان، چونكه ده‌زگا دیكتاتۆریه‌كان هه‌ڵوه‌شاونه‌ته‌وه‌و ده‌سه‌ڵاتێكی چه‌سپاو بوونی نییه‌و چه‌ند هێزێكی حزبی‌و میلیشیایی بوونی هه‌یه، ده‌كرێت له‌ئێستادا ئه‌م نه‌وه‌یه فشاری جدی دروست بكه‌ن له‌سه‌ر حزب‌و میلیشیاكان بۆ چه‌سپاندنی ده‌ستورێكی مه‌ده‌نی كه ته‌واوی بنه‌ما دیموكراسیه‌كان له‌خۆبگرێ‌و یاسا باڵا ده‌ست بێت‌و مافه‌كانی هاوڵاتی بوون به‌بێ جیاوازی ڕه‌گه‌زی بسه‌لمێنرێ‌و مافه ئازادیه‌كانی هاوڵاتیان له‌ئازادی ڕاده‌ربڕین‌و مافه ئابوریه‌كان بسه‌لمێنرێت، چونكه ئێستا فورسه‌ت له‌باره‌ی دامود‌ه‌زگایه‌كی به‌هێزی سه‌ركوتگه‌ر بوونی نیه‌و ده‌كرێ سود له‌م هه‌لومه‌رجه وه‌ربگیرێ به‌قازانجی گۆڕانكاری به‌ره‌و به‌دیموكراسی كردنی كۆمه‌ڵگا.

ئه‌گه‌ر له‌ئێستادا ئه‌و كاره نه‌كرێ، ئه‌وا به‌دڵنیایی فورسه‌ت له‌ده‌ست ده‌چێت‌و هه‌موو ئه‌و ئه‌گه‌رانه‌ی به‌ره‌و دیموكراسی بوونی كۆمه‌ڵگا ده‌چێت، له‌بار ده‌چێت‌و كۆمه‌ڵگایه‌كی دیكتاتۆریانه به‌رهه‌م دێته‌وه...

## باوەڕبوون بەتوانای ژن بۆ بەشداری سیاسی

قسەکردن لەسەر توانای ژن‌و بەشداری کردنی، لەکایە سیاسیەکان‌و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگادا، کارێکی گەلێك قورس‌و گرانە، بەتایبەت لەو کۆمەڵگایانەی کە هیچ ئامادەگیەکی مرۆییانە بەرامبەر بە ژن بوونی نییەو، ژن کائینێکی پەراوێزخراوەو هیچ حسابیکی لەسەر ناکرێت، تەنها وەك وەسیلەیەك بۆ خۆشگوزەرانی پیاو خستنەوەی منداڵ چاوی لێ دەکرێ.. بوونی ئەم عەقڵیەت‌و کەلتورە لەکۆمەڵگاکانی خۆرهەڵات دا، لەخۆیەوە سەرچاوەی نەگرتوە بەرامبەر بە ژن‌و باگراوندێکی قوڵی ئایینی‌و خێڵەکی هەیەو مێژووەکی هەزار ساڵ زیاتر دەبێت‌و نەوە دوای نەوە درێژکراوەتەوەو چوارچێوەو سنوری زیاتری بەخۆیەوە گرتوەو چووەتە چوارچێوەی عەقڵیەت‌و دەستورەوە کاری لەسەر کراوە.. هەموو کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی‌و مەزهەبی ژنان تیایدا پلەیەك لەخوار پیاوەوەن‌و بەچەندین جۆریش ئەو پلە دووییەی ژنان پیرۆزکراوەو هەزارو یەك پاساوی ئایینی‌و ئەخلاقیان بۆ مانەوەی پلە دووی ژنان هێناوەتە ئاراوەو کاری لەسەر کراوەو ژنانیان ناچارکردوە، کە بەو ژیانە ڕازیبن‌و تا ئەندازەی ئەوەی کە ژنان وا هەست بکەن، کە ئیدی ئەو چارەنوسە هەر لە ئەزەلەوە بۆیان دیاری کراوەو نابێت لێی لا بدەن.. بەهەر حاڵ هەموو گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی‌و بەرەوپێش چوونی مافی ژنان لە دنیاداو هاتنە مەیدانی ژنانیش بەپێی گۆڕانکاریەکان‌و پێش کەوتنی هوشیاری، هۆکارێك بووە بۆ ئەوەی ژنان لەچوارچێوەی ماڵ بێنە دەرو بەشداری کاراو چالاکانەی شۆڕش‌و گۆڕانکاریەکان‌و بەڕێوەبردنی ئیدارەو بەشداری کردن لە کاروباری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی بکەن‌و بە بەشێکی سەرەتایی لە مافەکانیان بگەن،

كە ئەو گۆڕانكاریانەش دوای هەزاران قوربانی لەخۆرئاوادا هاتە بوون‌و ژنان توانیان بوونی خۆیان، وەك مرۆڤێكی بەتوانا بسەلمێنن‌و ببنە هەوێنی گۆڕانكاری‌و پێشكەوتن‌و ئەوەش وای كرد چەندین ژنی بەتوانا لەبواری سیاسی دەربكەن‌و بوونی خۆیان لەناوەندی سیاسی دا بسەلمێنن‌و جێ دەستی خۆیان دیاری بكەن‌و هەموو شەقڵە كۆنەكان لەسەر بێ توانایی ژنان بۆ بەشداری سیاسی بسڕنەوە...

ئەو گۆڕانكاریانەی بەسەر مافی ژنان‌و بەشداری كردنیان لەبواری سیاسی دا، لەخۆرئاوا هاتە بوون بەرئەنجامی خەبات‌و یاخی بوونی چەندین ساڵەی خۆیان‌و كۆڵنەدانیان بووە، بۆ تێك شكاندنی عەقڵیەتی كۆنخوازی‌و سەیركردنی ژن، وەك وەسیلەیەك بۆ چێژوو مناڵ خستنەوە، ئەمەش وای كرد كە پیاوان باوەڕ بەوە بهێنن، كە ژنان لەباری سیاسیەوە توانایان هیچ كەمتر نییەو دەبێت باوەڕ بەوە بهێنین‌و گۆڕانكاری لە عەقڵیەت‌و دەستوردا بكەین‌و ئەو بوارەش بۆ ژنان والا بێت مومارەسەی تواناكانی خۆیان لەباری سیاسیەوە بكەن... گەرچی ئەو گۆڕانكاریانەو باوەڕهێنان بەتواناكانی ژن، بۆ بەشداری سیاسی، لەزۆرترین حاڵەت تەنها خۆرئاوایی گرتەوەو خۆر هەڵاتیش لەسەر عەقڵیەتی چەپاندن‌و چەوساندنەوەی ژنان بەردەوام بوو هەموو ڕێگاكانی لەبەردەم ژنان دا داخستبوو، هەموو ئەوانەشی بە بیانووی ئایینی‌و خێڵەكی‌و عەقڵیەتی پیاوسالارییەوە بەستبوەوە. بۆیە ژنان لە كۆمەڵگاكانی خۆرهەڵات دا هەموو ڕێگایەكیان لەبەردەم دا داخراوەو ناتوانن مرۆڤێكی كارابن بۆ گۆڕانكاری‌و بەرەوپێش چوونی ماف‌و ئازادیەكان‌و ڕۆڵیان هەبێت لە گۆڕانكاری دا، ژنان لەبەشێكی زۆر لەووڵاتانی خۆرهەڵات مافی ئازادی خۆشەویستی‌و هاوسەری‌و چوونە دەرەوەیشیان لێ زەوت كراوە، جا چۆن بتوانن بەشداری كاروباری سیاسی

بكەنو بتوانن ڕۆڵی كارای خۆیان بگێڕن، یاخود بەشداری بكەن لە كاروباری سیاسیو ببنە خاوەنی بڕیارو قسەكردن لەسەر سیاسەتو مەكانەیەكی سیاسی بگرنە دەست، چونكە خۆرهەڵات تا ئەو پەڕی دژی هەموو مافەكانی ژنانو ئازادیەكانیەتیو هەزارو یەك سانسۆری ئەخلاقیو كۆمەڵایەتیو ئایینیان بۆ ژنان داناوە بۆ ئەوەی زنجیریان بكەنو لەچوار دیواری ماڵەوە زیندانیان بكەن، بەدرێژایی مێژوو كۆمەڵگاكانی خۆرهەڵاتی بەو شێوەیە لە ژنانیان ڕوانیوەو ئەم ڕوانگەیەش بۆ ئێستا درێژ بووەتەوەو كاری لەسەر دەكرێت، هەڵبەتە لەدوای ئەو هەموو گۆڕانكاریانەی بەسەر مافەكانی ژناندا هاتوە لە دنیاداو ئەو پێشكەوتنە بەرچاوانەی لەبواری زانستو زانیاریو تەكنەلۆژیاو مافە ئینسانیەكاندا بە وجود هاتووە، بەناچاریو لەرووكەش دا بەشێك لەوڵاتانی خۆرهەڵات بۆ جوان كردنی ڕووی خۆیانو شاردنەوەی عەقڵیەتی كۆنەپەرستیو شەرەف پارێزی ڕێگەیان بەژنان داوە بەشداری هەڵبژاردن بن، ئەوەش بەوەی تەنها بۆیان هەیە هەڵبژێرن، نەك خۆیان هەڵبژێرن بۆ پۆستە سیاسیەكانو ئیدارە بگرنە دەست دیارە ئەوە هەموو كۆمەڵگا خۆرهەڵاتیەكان دەگرێتەوە، ئەمە جگە لەوەی تائێستا ژنان لەدەستورو یاساكانی زۆرینەی وولاتانی خۆرهەڵات دا پلەیەك لەخوار پیاوەوەنو بچوكترین ماف، كە ئازادی سەفەر كردنە ڕێگەیان پێ نادرێتو دەستوری وولاتەكان ڕێگەیان بەوە نەداو ژنێك بە تەنها سەفەر بكات، كە ئەوە بچوكترین ماف بێتو عەقڵەتێك ئەوە قبوڵ نەكان دەبێت چۆن ڕێگە بەژنان بدات خاوەنی بڕیاری سیاسی بنوو قسە لەسەر كۆمەڵگاو چارەنوسو ئاییندەی بكەن، بۆیە لێرەوە دەتوانین بڵێت ژنان لەكۆمەڵگاكانی خۆرهەڵات دا چەوساوەترین مرۆڤنو كەمترین بواریان پیدراوە بەشداری بڕیاری

سیاسی بکەن‌و قسەی جدیان هەبێت، چونکە پیاوی خۆرهەڵاتی هەرگیز باوەڕی بەخودی ژنان نەبووەو، وەك مرۆڤێکی گومان لێکراو فریودەر سەیر کردوەو هەمیشە زنجیری کردوە، نەك ئەوەی باوەڕ بەوە بهێنێت، کە ژن تواناکانی بخاتە کارو بیروڕای سیاسی هەبێت‌و بەشداری ململانێکان بکات‌و بیروڕای تایبەتی هەبێت لەسەر کۆی ڕوداوو گۆڕانکاری‌و پێش هاتە سیاسیەکان. بەگشتی پیاوی خۆرهەڵاتی باوەڕی بەهیچ بەشداریەکی ژنان نییە لەکاروباری سیاسی‌و بگرە بەردەوام لەمپەری داناوە بۆ بەشداری ژنان لەکاروباری سیاسی‌و هیچ کاتێکیش پاساوێکی لۆژیکی بۆ ئەو کارەی پێنەبووە، جگە لەپاساوی ئەخلاقی‌و ئایینی، کە ئەو پاساوانەش هیچ بنەمایەکی زانستی لێ نەکەوتوەتەوەو بگرە تەنها ترس‌و نیگەرانی پیاوە لەهاتنە مەیدانی ژنان بۆ کاروباری سیاسی.

خۆرهەڵات بەگشتی تائێستا لەسەر عەقڵیەتی نەفی کردنەوەی ژنان بۆ کاروباری سیاسی کار دەکات‌و ڕەنگە لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر ئەو عەقڵیەتی نەفی کردنەوەیە گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێت شێوازی گۆڕانکاریەکان جیاوازبن، ئەگەرنا لەناوەڕۆك دا هەموویان بەیەك ئاراستە بیر دەکەنەوەو ئەوەش سایکۆلۆیەتی هەزاران ساڵەی پیاوی خۆرهەڵاتیە.. ئێستاش لەزۆرێك وولاتانی خۆرهەڵات دا ڕێگە نادەن ژنان سەیارە لێ بخوڕ. جا چۆن ڕێگە دەدەن بەشداری کاروباری سیاسی بکەن‌و ڕەخنەو قسەیان هەبێت، یاخود پۆستی سیاسی وەربگرن‌و ئیدارە بەڕێوە بەرن، ئەوە گەورەترین گرفتی عەقڵیەتی پیاوی خۆرهەڵاتیە وەئەمەش لەوەیوە سەرچاوەی گرتووە، کە ژنان مرۆڤێکی ناسك‌و عاتفین‌و بەکەڵکی کاروباری سیاسی نایەن، هەر ئەو دەربڕینە ماهیەتی پیاوی خۆرهەڵاتی ئاشکرا دەکات بەوەی کە بەهیچ شێوەیەك ئامادە

نیین دەست بەرداری پلە دووی ژنان بن‌و دەروازەکان بەڕووی تواناکانی ژناندا والآکەن‌و لە مرۆڤێکی پلە دووەوە بگەڕێنەوە مرۆڤێکی ئاسایی‌و خاوەنی ماف‌و سەروەری خۆیان.

کۆمەڵگای عێراقیش، وەك کۆمەڵگایەکی خۆرهەلآتی هەڵگری هەمان خەسڵەت‌و تایبەت مەندی کۆمەڵگایەکی خۆرهەلآتیەو عەقڵیەت‌و بیرکردنەوەی سەبارەت بە ژن هەمان شتەو بەردەوامیش کاری لەسەر سڕینەوەی مافە ئینسانیەکان ژنان کردووەو بەشوێن توندکردنەوەی سانشۆرەکانەوە بووە دژی ژنان‌و مافەکانیان... عێراقیش هەڵگری هەمان کەلتوری پیاوسالاری‌و ئایینی‌و خێڵەکیەو بەبێ ئەو کەلتورەش ژنان پلە یەك لەخوار پیاوەوەن‌و ڕەوا نییە هیچ مافێکیان هەبێت، جگە لەلەزەت بەخشین بەپیاوان‌و خستنەوەی نەوە، ئەم عەقڵیەتە وای کردووە ژنان ڕۆژانە دووچاری توندو تیژی‌و ئازادی دەرونی‌و جەستەیی دەبن‌و ڕەشبینن بن بەرامبەر بەئەگەری گۆڕانکاری‌و دەرخستنی تواناکانیان‌و سەلماندنی بوونی خۆیان وەك مرۆڤ، بۆیە ژنان لە عێراق دا کەمترین دەرفەت لەبەردەمیاندا نەبووە بۆ کاروباری سیاسی‌و بەشداری لەکاروباری سیاسی‌دا، سەرباری ئەوەی ڕێگریان لێ کراوە بۆ خوێندن‌و هەڵبژاردنی چارەنوسی خۆیان بەئازادانەو پاساوەکانیش تەنهاو تەنها پاساوی ئایینی‌و مۆڕاڵی بوون، چونکە بەپێی ئایین ڕەوانییە ژنان خۆیان بڕیاری لەسەر چارەنووسی خۆیان بدەن، کە بەدڵنیایی بەشداری سیاسی ئازادی تاکەو مافی بێ ئەملاو ئەو لایەتی کاتێك ئەو مافەی لێ زەوت دەکرێت، لە بونەوەرێکی کاراوە دەبێتە بوونەوەرێکی کارلێکراو دووچاری سایکۆلۆژیای شکست دەبێت، ئەمەش بەڕوونی بەژنانی عێراقەوە دیارەو، کە ژنانی عێراق ئێستا بەتەنها مرۆڤێکی کار لەسەرکراون‌و بەکار دێن بۆ بەرژەوەندیەکانی پیاوان‌و جێبەجێ بوونی

خواستەكانیان، بۆیە دەبینین ژنان لە عێراق دا، كەمترین بەشداریان هەبووە لەبواری سیاسی داو ئەو ڕەوشەش بەدرێژایی مێژوو درێژەی كێشاوەو ئێستاشی لەسەر بێت ژن كەمترین بەشداریان هەیە لە مەیدانی سیاسی دا، چونكە عەقڵیەتی پیاوسالاری‌و دەستوریش ئەو مافەی نەداوەو باوەڕی بەتوانای ژنان نییەو لەكاروباری سیاسی دا... گەرچی لەناوەڕاستی سەدەی بیستەوە چەندین ڕێكخراوی ژنان دورست بون‌و بەشێكی زۆر لە حزب‌و ڕێكراوو گروپەكان، بۆ جوان كردنی ڕووی خۆیان چەندین ژنیان هێنایە ناو ڕیزەكانی خۆیان، ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی ئەو یەكانە باوەڕیان بەبەشداری ژنان هەبووە لەكاروباری سیاسی دا، بەڵكو بۆ جوان كردنی ڕووی خۆیان‌و خۆ لەقەڵەم دانیان بەمەدەنی‌و مۆدێرن، كە هەموو ئەو كارانەیان فۆڕم سازی‌و فریودانی ژنان بووە، لەلایەن حزب‌و یەكە جۆراوجۆەركانەوە بۆ جوان كردنی ڕووی خۆیان، ئەگەرنا تائێستا ژنان لەكۆمەڵگای عێراق دا پلە دوون‌و لەدەستوردا پلەیەك لەخوار پیاوەوە حسابیان لەسەر دەكرێت، بەڵام لەرووی كاروباری سیاسیەوە ئێستا كەمێك گۆڕانكاری ڕووی داوە، بەتایبەت دوای ڕووخاندنی بەعس‌و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی ئەو دەسەڵاتە دیكتاتۆرەو بڵاوبوونەوەی فرە حزبی‌و دورست بوونی چەندین ڕێكخراوە گروپی جۆراوجۆر، كە بەرگری لەمافەكانی ژنان دەكەن‌و ژنان بەشداری هەڵبژاردن دەكەن‌و بەشێك لەژنان پۆستی دەوڵەتیان بەهۆی حزبەكانەوە بەدەست هێناوە، بەڵام ئەمەش لەپلەی یەكەم دا بەو مانایە نییە كە گۆڕانگاری لە عەقڵیەتی پیاوسالاری دا ڕووی داوەو پیاوان لەباوەڕبوونیان بەتواناكانی ژنان بۆ كاروباری سیاسی ئەو پۆستانەیان پێبەخشیون، بەپێچەوانەوە كۆی ئەو كارانەی پیاوان كردویانە بۆ بەخشینی سیمایەكە بەدەسەڵاتەكەیان‌و نیشاندانی وێنەیەك بۆ غەرب،

كە ئەمانیش باوەڕیان بە بەشداری ژنان هەیە، لەكاروباری ئیداری‌و سیاسی داو ئەوەتا ژنان پۆستی جۆراوجۆری بەرز وەردەگرن‌و بەشداری لەبڕیاری سیاسی دا دەكەن، كە لەڕاستی دا ئەو ژنانەی بەشداریان لەو یەكانەدا پێكراوە تەنها شكڵێكن‌و خاوەنی هیچ بڕیارێك‌و بەشداریەكی سیاسی نین‌و لەپشت ئەوانە پیاوەكانی حزب بڕیاریان بۆ دەردەكات‌و ئەوانیش جێبەجێ دەكەن، بۆیە دەتوانین بڵێین پیاوانی كۆمەڵگای عێراقی باوەڕیان بەبەشداری سیاسی ژنان نییە لەكۆی كارەكانی كۆمەڵگاداو تەنها زۆر جار بەناچاریی‌و بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەكاریان دەهێنن، بەناوی بەشداری ژنانەوە. گەرچی ژنان بەڕێژەیەكی بەرچاو بەشداری هەڵبژاردنەكان دەكەن‌و خۆیان ماندوو دەكەن، بەڵام هیچ كات بەماو مانایە نییە كە ژنان خۆیشیان گەیشتبنە ئەو ئاستەی لەتێگەیشتنیان بۆ بڕیارێكی سیاسی بەشداری دەكەن، یاخود لە باوەڕبونیان بەتوانای سیاسی خۆیان‌و ئەگەری گۆڕانكاری ئەو بەشداریە جدیە دەكەن، نەخێر بەشداری ژنان لە پرۆسەكان دا جێبەجێ كردنی خواستی حزب‌و عەقڵیەتی پیاوسالاریەو ئەو پاڵنەرە خێزانی‌و خێڵەكی‌و عەشایرییە كە پاڵ بە ژنانەوە دەنێت بەقازانجی ئەو یەكانە بەشداری پرۆسەكان بكات، لەدەرەوەی ئەو بەرژەوەندیانە كەمترین بوار بۆ ژنان بوونی نییە بەئازادی خۆی بەشداری پرۆسە سیاسیەكان بكات‌و ڕۆڵی ئەكتیڤی خۆی نیشان بدات بەقازانجی بەرژەوەندی‌و مافەكانی‌و هەوڵدان بۆ دوروست كردنی جۆرێك لەباوەڕبوون لەلای پیاوان، بۆ ئەوەی كە ئەم بوونەوەرە توانای بەشداری كاری سیاسی‌و گۆڕانكاری هەیەو دەبێت ڕێز لە بیروڕاكانی بگیرێت... عێراق لەدوای پرۆسەی ڕووخانی بەعس، ژنان سێ جار بەشداری دەنگدانیان كردووە، بەمانایەكی تر سێ جار بەشداری پرۆسەی سیاسی‌و یاسایی عێراقیان

کردووەو بەرێژەیەکی بەرچاویش بوونیان هەبووە، لەبەردەم سندوقەکانی دەنگدان، بەڵام زۆرینەی ئەو بەشداری کردنە پاڵنەری حزبی‌و خێزانی‌و بنەماڵەیی لەپشتەوە بووەو، لەباوەڕبوون بەماف‌و ئازادیەکانی خۆیەوە نەبوەو بگرە ئەو باوەڕە بوونی نەبووە لەلای زۆرێك لەو ژنانەی بەشداری پرۆسەکانیان کردووەو زۆرجاریش نەیزانیوە کە بۆچی بەشداری پرۆسەیەکی سیاسی، یاخود دەنگ دان دەکات، بەقەدەر ئەوەی پیاوانی حزب، یان پیاوی ناو خێزان فەرمانی بەشداری کردنی پێکردوە... بۆیە دەتوانین بڵێین تائێستاش لە عێراق دا ئەوە نەبووەتە عەقڵیەت، کە ژنان توانای بەشداری سیاسیان هەیەو دەتوانن، لە بڕیارە گرنگەکان دا بەشداربن‌و خاوەنی بیروباوەڕی خۆیان بن، دیارە ئەوەش دوولایەنی هەیە:

1- پیاوانی کۆمەڵگای عێراق، پیاوانێکی تەقلیدی‌و ئایینی‌و خێڵەکین‌و هیچ کات باوەڕیان بە ماف‌و ئازادیەکانی ژنان نییەو، وەك مرۆڤێکی خاوەن بڕیارو ئیرادە سەیریان ناکەن‌و بەردەوام بەپاشکۆی ئارەزوەکانی خۆیانیان دەزانن‌و بۆ هەر پرۆسەیەکیش کە ڕێگەی بەشداری کردنیان پێبدەن، تەنها بۆ مانەوەو پاراستنی مافەکانی پیاوانە.

2- ژنانی کۆمەڵگای عێراقی بەهۆی ئەو هەموو چەوساندنەوەیەی لەسەریان بووە لەلایەن عەقڵیەتی پیاو سالاری‌و ئایینیەوە، کەمترین بواریان پێ نەدراوە بیر لەماف‌و ئازادیەکانیان بکەنەوە، نەك ئەوەی ببنە خاوەنی بیروباوەڕی سیاسی‌و لەئاگایی سیاسیان بەشداری کاروباری سیاسی بکەن، بەمانایەکی تر تائێستا ژنان نەبوونەتە خاوەنی زانیاریەکی باش لەبارەی زانستی سیاسیەوە، کەمەش وای کردووە بەپاشکۆیەتی عەقڵیەتی پیاوسالاری بمێننەوە.

ئەو دوو هۆكارە پاڵنەری بنەڕەتیە بۆ پەراوێزخستنی ژنان لەكاروباری سیاسی‌و بەشداری كردنیان وەك كارێكی تەقلیدی‌و بەقازانجی پیاوان، هەر بۆیە تائێستاش ژنان نەیانتوانیوە ببنە خاوەنی بڕیاری ئازادانەو سەربەخۆی خۆیان بۆ هەر پێشهاتێكی سیاسی‌و گۆڕانكاریەكان.

## ژن و بەشداریکردن لەهەڵبژاردندا

پرۆسەی هەڵبژاردن، پرۆسەیەکی تەواو دیموکراسیانەیە ئەگەر بەپێی لۆژیکی مافی هاولاتی بوون و بەشداری کردنی تاکەکان بەبێ سانسۆرو ئازادانە بێت.

ئەنجامدانی هەڵبژاردن بۆ دیاری کردنی نوێنەرایەتی مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەوڵەتی ئەسینی و لەوێوە پرۆسەی هەڵبژاردن ئەنجام دراوەو هاولاتیان بەشداری ئەو پرۆسەیەیان کردوە بۆ دیاری کردنی نوێنەرو دروست کردنی دەسەلاتو پەرلەمان، گەرچی لەکۆن دا هەڵبژاردن و پرۆسەی بەشداری کردن، لەسەردەمی یۆنانی کۆندا تەنها بۆ بالادەستو دەوڵەمەندان بووەو کۆیلەو ژن، مافی بەشداری کردن و دەنگدانیان نەبووە، بەلام وورده وورده پرۆسەی هەڵبژاردن و بەشداری کردن بەپێی پێشکەوتن و هوشیاری زیاترو گۆڕانکاریەکان لە عەقڵ و فکردا پرۆسەی هەڵبژاردن و بەشداری کردن گۆڕانی بەسەردا هاتوەو لە قۆناغێکی کاڵ و کرچ و سەرەتاییەوە گەشەی کردووەو پێش کەوتوە، بەلام بەهەموو پێشکەوتن و گۆڕانکاریەکانەوە تا سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی پرۆسەی هەڵبژاردن بەبێ بەشداری ژن و کۆیلە ئەنجام دراوەو هەڵبژاردن لەنێوان بالادەستو خاوەن دەسەلاتو خاوەن کۆیلەکاندا ئەنجام دراوەو کاریان کردوە بۆ پاراستن و مانەوەی خۆیان بەبەهێزی و بالادەستی و پشت گوێ خستنی مافەکانی هاوولاتیان بەگشتی، لەبەر ئەوەی لەرابوردودا شتێك نەبووە بەناوی هاولاتی و کۆمەلگا دابەش بووە بەسەر دوو چین دا، پاشاو میرو خاوەن کۆیلەکان، کە هاولاتی بوون و ژن و کۆیلەش چینەکەی تر بوون، کە بەهاولاتی دا نەنراون و هیچ حسابێکیان بۆ نەکراوەو لەهیچ بڕیارو هەڵبژاردنێك

مافی بەشداری کردن‌و پرس پێکردنیان نەبووە، بەڵام بەهاتنی شۆڕشی گەورەی فەڕەنساو سەردەمی رۆشنگەری‌و گەورەترین وەرچەرخانی هێنایە ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی گۆڕانکاریش بەسەر شێوازی هەڵبژاردن دا هات‌و بەشداری کردنی هاوڵاتیان بووە شێوازێکی گشتی‌و لەچوارچێوەی دەسەڵاتی باڵادەستان دەرچوو. لەگەڵ ئەوەی بەشداری کردن لەهەڵبژاردن تەنها لەسنوری ڕەگەزی (نێردا) مایەوەو ژنان بۆیان نەبوو بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردن بکەن، بەڵام بۆ یەکەمین جار لەساڵی (1849) لە یەکێك لە وولایەتەکانی ئەمریکا ژنان بەشداری هەڵبژاردنیان کردو، ئەمەش بە یەکەمین شکاندنی شقڵی هەڵبژاردن دێت‌و ئیدی هەڵبژاردن سنوری ڕەگەزی دەبەزێنێت‌و وورده وورده پرۆسەی هەڵبژاردن بەبەشداری ژنانەوە وولاتەکانی تریش دەگرێتەوەو ژنان ئەو مافەیان پێدەدرێت، کە بچنە ناو پرۆسەی هەڵبژاردن‌و مافی دەنگدانیان هەبێت، بەڵام بەبێ ئەوەی مافی ئەوەیان هەبێت خۆیان هەڵبژێرن‌و پۆستە سیادیەکان وەربگرن... بەشداری کردنی ژنان لە پرۆسەی هەڵبژاردن بوارێکی زیاتری ڕەخسان بۆ ئەوەی زیاتر بەماف‌و ئازادیەکانیان هۆشیار ببنەوە بزانن بەشداریکردنیان لە هەڵبژاردن هەنگاوێکە بۆ سەلماندنی بوونی خۆیان‌و گەیشتن بە مافی هاوڵاتی بوون.

لەگەڵ ئەوەی سەرەتا تەمەنی هەڵبژاردن بە سی ساڵ دەست نیشانکرا، (بڕوانە کتێبی سیتمی هەڵبژاردن لەکوردستان، نوسینی ڤیان مەجید) دواتر قۆناغ دوای قۆناغ ئەو تەمەنە گۆڕانکاری بەسەردا هات‌و گەرچی دانانی تەمەنی سی ساڵی لەوێوە سەرچاوەی گرتبوو ئەگەر مرۆڤ کامڵ نەبێت بەدڵ‌و بە گیان بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردن ناکات‌و تەنها لایەنی سۆزو عاتیفە بەسەری دا زاڵ دەبێت‌و بڕیاردانەکانی

بڕیاردانێکی سەلماندنییەو کاریگەری باش نابێت لەسەر پرۆسەی هەڵبژاردن‌و کاندید کراوەکان. بەڵام دواتر ئەو تەمەنەش گۆڕانکاری بەسەردا هات‌و لەساڵی 1848 گۆڕا بۆ بیست‌و یەك ساڵ‌و دواتر لەساڵی 1974 بەدواوە تەمەنی بەشداری کردن لە هەڵبژاردن لەفەرەنساو زۆرینەی وولاتان بووە بە (18) ساڵ، کە ئەوەش بەتەمەنێکی لێهاتو مەدەنی دادەنرێت.. هەڵبژاردن لەزۆرینەی وولاتانی دوونیا بووە پرۆسەیەکی گشتی‌و هەموو سنورداریە ڕەگەزیەکانی لەسەر هەلگیراو هەموو ئەو هاولاتیانەی تەمەنی یاساییان هەبوو دەیانتوانی بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردن بکەن‌و خۆشیان هەڵبژێرن بەبێ هیچ ڕێگریەکی ئایینی‌و ڕەگەزی، لەگەڵ ئەوەی لەهەندێك وولاتان ڕێگەیان بە ئەو هاولاتیانە نەدەدا بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردن بکەن، کە بەبیانی ناویان دەبردن، ئەگەر ڕەگەزنامەی ئەو ولاتەشیان وەگرتبێت، ئەوەشیان بە پاراستنی بەرژوەندی ئاسایشی گشتی وولات لەقەڵەم دەدا. بۆ نموونە ولاتێکی وەك عێراق بەهیچ شێوەیەك ڕێگە بەبیانی نادات ئەگەر ڕەگەزنامەی عێراقیشی وەرگرتبێت بەشداری هەڵبژاردن بکات.. بەهەر حاڵ پرۆسەی هەڵبژاردن قۆناغ دوای قۆناغ گۆڕانکاری گەورەی بەسەردا هاتووەو بەشداری کردن لە هەڵبژاردن بووەتە پرۆسەیەکی تەواو دیموکراسیانەو هەموو تاکەکانی بەبێ جیاوازی ڕەگەزی‌و ڕەنگی پێست‌و جۆری پیشە بۆیان هەیە بەشداری پرۆسە هەڵبژاردن بکەن‌و خۆیان کاندید بکەن بۆ وەرگرتنی پۆستە سیادی‌و ئیداریەکان، لەگەڵ ئەوەی ژنان لەزۆرینەی وولاتان دا بەو هەموو گۆڕانکاریەی بەهۆی پێشکەوتنی زانست‌و زانیاریەوە ڕووی داوەو ژنان بەشێوەیەکی بەرچاو بەشداری کاری کۆمەلایەتی‌و سیاسی دەکەن، بەڵام مافی دەنگدانیان لێ زەوت کراوەو ڕێگەی بەشداری کردنی هەڵبژاردنیان نەداونەتێ.

ئەوەش زیاتر تایبەتە بەو وڵاتانەی لەڕووی سیستمی کۆمەڵایەتییەوە دواکەوتون‌و ئێستاش خاوەنی عەقڵیەتی پیاوسالاری ئایینی خێڵەکین‌و لەو جۆرە دەسەڵاتانەدا ژنان مافی بەشداری کردنیان نییە لە هەڵبژاردن دا، چونکە ئەو دەسەڵاتانە ئەوە لە عەقڵیەتیاندا جێگیر بووە، کە کاری ژنان ناومالْ‌و خزمەت کردنی پیاوان‌و خستنەوەی منداڵەو بەخێوکردنیانە، نەك بەشداری کردن لە پرۆسەی سیاسی‌و ئیدارەکردنی کۆمەڵگا... هەڵبەتە یەکەمین وولاتێك کە مافی بەشداری کردنی بەژنان بەخشی بۆ هەڵبژاردن وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووەو دواتریش بەرەسمی ئەو مافەی لە دەستوردا چەسپاندووەو کاری لەسەر کردوە، بەدوای ئەویش دا چەندین وولاتی تر مافی بەشداری کردنیان بەژنان لە هەڵبژاردن بەخشیوە وەك (بەریتانیا، سۆڤیەت، ئەڵمانیا، سوید، نەرویج، دانیمارك، ئیسپانیا...هتد)، هەرچەندە تائێستاش لەزۆرێك لە وولاتان مافی هەڵبژاردن بەژنان نەدراوە، بەبیانوی ئەوەی ژنان توانای بەڕێوەبردنی ئیدارەو کاروباری سیاسیان نییە لەکاتێکدا ئەو پاساوانە بۆ پەراوێزخستنی ژنان لەبەڕێوەبردنی ئیدارەو کۆمەڵگا هیچ بنەمایەکی زانستی نییە، بەقەدەر ئەوەی لە عەقڵیەتی کۆنەپەرستی‌و دواکەوتویی نەبێت، چونکە ئەو دەوڵەتانەی لەسەر بنەمای عەقڵیەتی پیاوسالاری ئایینی‌و خێڵەکی بیر دەکەنەوە، ژن لەلایان تەنها وەسیلەی خۆشگوزەرانییە بۆ پیاوان‌و هیچ مافێکی تریان نییە، هەر ئەو عەقڵیەتەشە لەزۆرینەی وولاتانی خۆرهەلات کاردەکات‌و بوەتە هۆی ئەوەی کە ژنان چەوساوەترین مرۆڤ‌و بێ مافترین مرۆڤ بن‌و تەواوی ماف‌و ئازادیەکانیان بەناوی شەرەف پارێزی‌و ناقص عەقڵیەوە لێ زەوت کراوە ڕۆژانە دووچاری ئەشکەنجەو لێدان دەبن بەدەست دەسەلات‌و پیاوانەوە.

بۆیە لەو وڵاتە دواکەوتوانەدا ژنان ناتوانن بەبڕیاری خۆیان بەشداری هەڵبژاردن بکە، بەڵکو بڕیاریان بۆ دەدرێت‌و بەزۆریش کاندید کراوەکانیان پێ هەڵدەبژێرن... بەشێکی زۆر لە وولاتانی خۆرهەلات رێگە بە ژنان دەدەن بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردن بکەن، بەڵام تائێستا ئەو دەسەڵاتانە باوەڕیان بەبەشداری ژنان نییەو تەنها وەك سیناریۆیەك رێگە بەبەشداری ژنان دەدەن بۆ جوان کردنی ڕووی خۆیان بەناوی دیموکراسیەتەوە، ئەگەرنا زۆرینەی وولاتانی خۆرهەلات دژی خۆکاندیکردنی ژنان بۆ پۆستی سەرۆکایەتی‌و هەزارو یەك پاساوی مۆراڵی‌و ئایینی بۆ دەهێننەوە، بۆ نمونە دەوڵەتی (ئێران) یەکێکە لەو دەوڵەتانەی کە بەهیچ شێوەیەك رێگە بەو کارە نادات‌و تەواو بەدژی ئایینی دەزانێت‌و زۆرێك لەوولاتانی تری خۆرهەلاتی خاوەن عەقڵیەتی پیاوسالاری ئایینی بەوە شێوەیەی لە ژنان دەڕوانێت، جیا لەوەی لە زۆرینەی وولاتانی خۆرهەلاتی پاشکەوتودا ژن هاولاتی نییەو بە پلەیەك لەخوار پیاوەوە حسابیان بۆ دەکرێت، بۆیە رێگە پێدانیشیان بۆ بەشداری کردن لە پرۆسەی هەڵبژاردن دا، تەنها وەك سمبولێك بۆ جوانکردنی ڕووی دەسەلاتەکەیان سەیری دەکەن‌و هیچ مافێکی پێ رەوا نابینن، زۆرێك لە وولاتانی خۆرهەلات تا ئێستا جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ جێبەجێ ناکەن، واتە مافی یەکسانی نێوان (ژن_پیاو) بوونی نییەو پیاوان بالادەست‌و خاوەن بڕیارن‌و تائێستا یاساکانی شەریعەت کار دەکات‌و ژنانی پێ مەحکەمە دەکرێت، بۆیە دەبێت بەشداری ژنان لەو جۆرە دەوڵەت‌و دەسەلاتانە چی بێت، یاخود بەشداری کردنیان لەهەڵبژاردن چی مانایەکی هەبێت؟ لەکاتێکدا دەسەڵاتەکان گوێ بەو هەموو گۆڕانکاریانە نادەن کە لەدنیای پێشکەوتن دا رووی داوەو ژنان لەدونیادا بەئاستێکی زۆر پێشکەوتون‌و بەشداری

تەواوی پێك هاتە سیاسیو ئیداریو کۆمەلأیەتیەکان دەکەن‌و پۆستە سیاسیە گرنگەکان بەدەست دەهێنن، بەلأم لەوولأتانی پاشکەوتو ژنان پلەیەك لەخوار پیاوەوە حساب دەکرێت‌و هەزارو یەك ڕێگر لەبەردەم مافو ئازادیەکانیان دروست دەکرێت.

بەهەر حالّ ئێستا ژنان بەشێوەیەکی بەرچاو بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردنەکان دەکەن‌و هەوڵی ئەوە دەدەن گۆڕانکاری بهێننە ناو کایە کۆمەلأیەتیەکانەوە کە ئەوە بۆ خۆی هەنگاوێکی باشە بۆ ئەوەی دەسەلأتەکان ناچار بکرێت یەکسانی (ژن_پیاو) بەڕەسمی بناسێت‌و لەدەستوردا بیچەسپێنن‌و هەموو ڕێگریەکانی بەردەم ژنان وەلا بنرێ‌و ژنان بەو پەڕی ئازادیەوە بەشداری پرۆسەی دەنگدان بکەن‌و خۆیان کاندید بکەن، چونکە تا ئەو جێگایەی ژنان بەو شێوە ژیانە نەگەن پرۆسەی هەڵبژاردن پرۆسەیەکی سنوردارەو بۆ پاراستنی بەرژەوەندی پیاوان‌و ژنان‌و بەشداری کردنیشیان تەنها بەقازانجی دەسەلأت‌و عەقلّیەتی پیاوسالاریو مانەوەی کۆتەکانی چەوساندنەوە لە ملی ژنان دەمێنێتەوە. بۆیە دەکرێت ژنان دوای ئەو هەموو بەشداری کردنە لە پرۆسەی هەڵبژاردن‌و فراوان بوونی زانست‌و زانیاریو پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو بەخشینی زانیاری زیاتر بەمرۆڤ بەمافو ئازادیەکانی، دەبێت هوشیارانە بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردن بکەن‌و لەڕێگەی پرۆسەکانی هەڵبژاردنەوە هەوڵی فراوان بوونی ئازادیەکانیان بدەن‌و مافەکانیان بچەسپێنن... ژنان بەگشتی وەك لەپێشتر ئاماژەم بۆ کرد لەوولأتانی پاشکەوتوی خۆرهەلأت دا، بەردەوام مافەکانیان پێشێل دەکرێت‌و ئازادیو مافەکانیان بە ئایینەدەی نادیار دەسپێردرێت‌و هەموو جارێکیش فریویان دەدەن بۆ بەردەم سندوقەکانی دەنگدان، بەبێ ئەوەی

بەشداری كردنیان لەو پرۆسانە گۆڕانگاری لە مافو ئازادیەكانیان بهێنێتە ئاراوە.

ژنان لە كۆمەڵگای عێراق دا، بەهۆی بوونی دەسەڵاتێكی ئایینی پیاوسالارییەوە كەمترین دەرفەتیان لەبەردەم دا نەبووە بۆ بەشداری كردن لە پرۆسەی دەنگدان، لەبەر ئەوەی پرۆسەكانی هەڵبژاردن لە عێراق دا زۆر بەكەمی ئەنجام دراوەو گۆڕینی دەسەڵاتەكان بەشێوەی ئینقلابی سەربازی ڕووی داوەو، هەر خۆی دروست كردنی عێراق لەشێوەی دەوڵەت دا لەسەر دەستی حكومەتی بەریتانیا ئەنجام دراوەو هەر ئەویش دەسەڵاتو سەرۆكایەتیەكەی دیاری كردووەو بەدوای ئەویش كۆی دەسەڵاتەكان بەهێزی سەربازی یەكلایی كراوەتەوەو هیچ پرۆسەیەكی هەڵبژاردنی دیموكراسی بوونی نەبوەو، بگرە هەتا ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس هیچ پرۆسەیەكی هەڵبژاردنی دیموكراسیانە لە عێراق بوونی نەبووە، هەر كارێكیش بەناوی هەڵبژاردنەوە ئەنجام درابێت سەرۆك یاخود حیزب باڵادەست خەڵكی بانگهێشت كردوە بۆ ئەوەی بەیعەتی پێبدەن‌و مانەوەی خۆی بۆ چەند ساڵێكی تر دیاری كردوە. بەبێ ئەوەی پرۆسەی هەڵبژاردن هیچ گۆڕانكاریە لەبەرێوەبردنی سیاسی‌و ئیداری‌و یاسایی دا بهێنێتە ئاراوە، ئەمەش بەومانایە نییە هەڵبژاردنی كارتۆنی‌و فریودان بۆ بەرچاوی میدیاو وڵاتانی دنیا ئەنجام نەدراوەو هاوڵاتیانیان بەناوی پرۆسەی دەنگ دانەوە كۆنەكردوەتەوەو، لەگەڵ ئەوەی ژنانیش بەشداری ئەو پرۆسانەیان كردووەو هەمیشە دەنگیان بەدەستووردو دەسەلاتێك داوەو بەشداری هەڵبژاردنیان كردووە، كە لەدژی مافەكانی خۆیان بووەو زۆر جاریش دەسەڵاتە یەك لەدوای یەكەكانی عێراق بۆ داپۆشینی ڕووی پڕ لە كارەساتو چەوساندنەوەیان دژی ژنان چەند ژنێكیان لە ئیدارەو

دەسەڵات بەشداری پێکردووەو پۆستیان پێداون، بەڵام هیچ کات ئەو ژنانە نەیانتوانیوە نوێنەرایەتی ڕاستەقینەی ژنان بکەن‌و کاریگەریان هەبێت لەسەر ڕەوشی نالەباری ژنان‌و چاککردنی... ژنان لە عێراق دا مێژوویەکیان هەیە لەبەشداری کردن لە هەڵبژاردنەکاندا لەگەڵ ئەوەی لە عێراق دا هیچ کات هەڵبژاردن بنەمایەکی دیموکراسی نەبووەو هەڵبژاردنی زۆرەملێیانە ئەنجام داروەو کارەکانی هەڵبژاردن سیناریۆیەکی دەسەڵات بووە بۆ فریودان‌و لەخشتە بردنی تاکەکانی کۆمەڵگا بەبێ جیاوازی ڕەگەزی.. کاتێك هەموو دەسەڵاتەکان بەدەست حیزبێکی دیاری کراوەوە دەبێت‌و بە ئارەزووی خۆی بڕیار دەدات‌و هیچ ململانێیەك لەسەر گۆڕینی دەسەڵات بەشێوەی دیموکراسی‌و هەڵبژاردن بوونی نییە، دەبێت بەشداری کردنی هاوڵاتیان لەهەڵبژاردن چی مانایەکی هەبێت بۆ هاوڵاتیان... ڕەوشی هەڵبژاردن لە عیراق دا لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا ڕووخاندنی بەعس بەو شێوەیە سیناریۆ ئامێزە درێژەی کێشاوەو هیچ جارێك دەسەڵات لەرێگەی هەڵبژاردنەوە نەگۆڕاوەو هاوڵاتیان ڕانەهاتون لەسەر ژیانی دیموکراسی‌و هەڵبژاردن، چونکە کۆی حکومەتەکان لە عێراق دا، لەسەر چەمکی فەلسەفەی خوێن کاریان کردووەو بەردەوام تاکێکی دڵ ڕەق‌و توندوتیژبوون‌و یاریان لەگەڵ خوێن دا کراوە، ئەم یاری کردنەش لەگەڵ خوێن دا هەموو سەرەتاکانی دیموکراسیەت‌و مافی بەشداری کردنی خەڵکی لە پرۆسەکانی دیموکراسی دا وون کردوە، کە مەرجی سەرەکی هەڵبژاردن بوونی مافی هاوڵاتی بوون‌و دیموکراسییە، کاتێك دیموکراسیەت بوونی نابێت، هەڵبژاردن مانایەکی نابێت، چونکە هەڵبژاردن لە وولاتێکی دیموکراسی دا ئەنجام دەدرێت‌و تاکەکان دەتوانن

ئازادانە بەشداری پرۆسەكانی هەڵبژاردن ببن‌و قسە لەماف‌و ئازادیەكانیان بكەن.

هەروەك لە پێشتر ئاماژەم بۆ كرد ژنان لە عێراق دا مێژوویەكیان هەیە لە پرۆسەی بەشداری كردن لە هەڵبژاردن‌و ئاگاییەكیان هەیە لە پرۆسەی هەڵبژاردن، بەڵام ژنان بەزۆری لەدوای پرۆسەی ڕزگاركردنی عێراقەوە بەڕێژەیەكی بەرچاوترو جۆرێك لە ئازادانەتر بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردنیان كردووەو دەنگیان داوە بەو لیستانەی كە خۆیان خواستیان بووە، بەڵام ئەم بەشداری كردنەی ژنان دوای پرۆسە تایبەتمەندی خۆی هەبووەو جۆرێك لە لایەنی عاتیفی‌و بەجۆرێكی تریش حزبی‌و بنەماڵەیی بەسەریاندا زاڵ بووەو كەمترین بەشداری كردنیان، بەشداری كردنێكی سەربەخۆیانە بووە، لەهەر سێ پرۆسەی هەڵبژاردن دوای ڕووخاندنی بەعس، كە هەڵبژاردنێكیان بۆ دەستوور بوو، لەكاتێك دا ژنان بە ڕێژەیەكی بەرچاو چوونە ناو پرۆسەی هەڵبژاردن لەسەر دەستوورو كەمترین زانیاریان هەبوو لەبارەی بەندەكانی دەستورو كەمترین مافیشیان لەو دەستوورەی كە دەنگیان بۆ دا هەبوو، چونكە ژنانی كۆمەڵگای عێراق، ئێستاش بەڕێژەیەكی بەرچاو نەخوێندەوارن‌و تەنها وەك لایەنێكی عاتیفی سەیری هەڵبژاردن‌و پرۆسەی دەنگدانیان كردووەو هەر لەوێشەوە زۆر بەپەرۆشەوە بەشداربوون لەگەڵ ئەوەی پاڵنەری خێزانی‌و بنەماڵەیەی‌و عەشیرەت‌و حیزبیش كاریگەری زۆر هەبوو، بۆ ئەوەی كە ژنان بەو ڕێژە زۆر بەشداری هەڵبژاردن بكەن، بەبێ ئەوەی چاوێكیان لەماف‌و ئازادیەكانیان بێت، ڕەنگە لایەنێكی تر بەشداری ژنان لەهەڵبژاردنەكان ئەوە بووبێت مێژووی عێراق هەتا دوای ئەو پرۆسەیە بەوجۆرە بوونی لیستی جیاو حیزبی جیاو كاندیدی جیای بەخۆیەوە نەبینی بێت‌و

عێراق هەر بە یەك ڕەنگ‌و یەك شێوە هەڵبژاردنی تیا ئەنجام دراوەو دەسەڵاتیش هەر لەشوێنی خۆی بووە، بۆیە نەك هەر بۆ ژنان، بەڵكو بۆ كۆی هاوڵاتیانی كۆمەڵگای عێراق بەشداری كردنیان لە هەڵبژاردنەكانی دوای پرۆسەی ئەو مۆركەی پێوە دیارە بووە.

ژنان توانیویانە لە عێراق دا بەشداری پرۆسەكانی هەڵبژاردن بكەن، بەڵام تائێستا ژنان نەیانتوانیوە سەربەخۆیانە بچنە ناو پرۆسەكانی هەڵبژاردن‌و كاندیدی تایبەتی خۆیان هەبێت، بەڵكو لەو چوارچێوە حیزبی‌و تایفەگەری‌و ئایینییە دەرنەچوون‌و بۆیە ئەوانەی دوای پرۆسەكانی هەڵبژاردن وەك نوێنەری ژنان لەناو پۆستەكاندا دەبن دانراون‌و نوێنەری دەنگی ڕاستەقینەی ژنان نین‌و زۆرێك لەو ژنانەی بەشداری پرۆسەكانی هەڵبژاردن دەبن دواتر پەشێمان دەبنەوە لەوەی بەشداریان كردووە.

## هەڵبژاردن و دەستوورو دیموکراسی

یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی دیموکراسی بوونی هەڵبژاردنو بەشداری کردنی هاولاتیانە لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو ئیدارەکردنی، هەر وولاتێك ئەو بنەمایانەی تیا نەبێت خاوەنی هیچ بیرۆکەیەکی دیموکراسی نییەو دەسەلاتێکی ڕەهاو تاك ڕەهەندیو دیکتاتۆریانەیە.

کۆمەڵگای عێراق، هەتا پرۆسەی ئازادیو ڕووخاندنی دیکتاتۆریەت هیچ بنەمایەکی هەڵبژاردنو پرس کردن بە هاولاتیان بوونی نەبووەو، دەسەلاتەکان لەسەرو ئیرادەی هاولاتیانەوە دامەزرێنراوەو بەزۆر بەسەر هاولاتیاندا سەپێنراوە، ئەمەش وای کردوە کۆی دەسەلاتەکان خاوەنی عەقلیەتی دیکتاتۆریو تاك ڕەهەندی بنو دژی هەموو مافو ئازادیەکانی هاولاتیان بنو هەرگیز گوێ بەمافی هاولاتیان نەدەنو بەردەوامیش سەرکوتی هەر نەخێرێکیش بکەن کە داوای مافو ئازادیو دابین کردنی پێداویستیەکانی ژیان بکات...

ئەزمونی حوکم ڕانی لە عێراق داو لەسەردەمی دروست کردنی دەوڵەت لە بیستەکانی سەدەی بیست دا تا ڕووخاندنی دوایین دەسەلات، کە ڕژێمی بەعس بوو، هیچ بنەمایەکی دیموکراسیو بەشداریەکی خەڵك، لەئیدارەکردنی دەوڵەت بوونی نەبووەو هەموو دەسەلاتەکان لە ڕێگەی کودەتای سەربازییەوە هاتونە سەر کورسی حوکمو هەر بە کودەتای سەربازیش لە حوکم لادراون، بۆیە خەڵکی عێراق لەسەر ژیانی دیموکراسی ڕانە هاتوونو هەرگیز هەڵبژاردن نەبوەتە بنەمای بیرکردنەوەی هاولاتیانو بەردەوام هاولاتیان پەراوێز خراونو گوێ یان لێ نەگیراوەو بۆ هیچ شتێك پرس بە هاولاتیان نەکراوە، بۆیە عێراق هەرگیز خاوەنی دەسەلاتێکی مەدەنیو دەستورێکی مەدەنی نەبووەو

دەستوور هەڵقوڵاوی ماف‌و ئازادی هاوڵاتیان نەبووە، بەقەدەر ئەوەی دەستوور بۆ پاراستنی حوكم ڕانەكان دانراوە...

كاتێك دەسەڵاتێكی تاك ڕەهەندی بوونی دەبێت‌و تەنها فەرمان دەر دەكات بۆ تاكەكانی كۆمەڵگا بەدڵنیایی هاوڵاتیان دەبنە كۆیلەو خواست‌و مافەكانیان ژێر پێ دەخرێت‌و پرۆسەی گۆڕانكاری‌و هوشیار بوونەوەش زۆر لاواز دەبێت‌و ناتوانێت لە پێك هاتەو عەقڵیەتی دەسەڵات دا گۆڕانكاری بكات‌و ڕێگا خۆش دەبێت بۆ خوێن ڕشتن‌و دیكتاتۆریەت، كۆمەڵگای عێراق بەدرێژایی دامەزراندنی دەسەڵات دیكتاتۆریەت‌و سەركوتی بەرهەم هێناوەو تاكی لاوازو دڵ پڕ لەترسی بەرهەم هێناوە، ئەو بێ دەنگی‌و ترسەش میلۆنان مرۆڤی كردووەتە قوربانی‌و گۆڕانكاری بەشوێن خۆی دا نەهێناوە، هەر ئەوەش وای كردووە هەنگاونان بەرەو دیموكراسی لە عێراق دا بوونێكی ئەوتۆی نەبووە زۆر لاواز بووەو هەمیشە ئەگەرەكانی دیكتاتۆریەت‌و سەركوت كردن بەهێز بووە. بۆیە تاك لە كۆمەڵگای عێراق دا بەردەوام چاوەڕوانی دەرەوەی خۆی بووە ڕزگاری بكات‌و هیوایەكی پێبەخشی‌و ماف‌و ئازادیەكانی بۆ وەربگرێت، بەمانایەكی تر تاكی عێراقی لەجیاتی كارتیكەر بێت‌و ئەكتیف بێت بۆ ماف‌و ئازادیەكانی، تاكێكی كارلێكراو بووەو هەموو ئەو دەسەڵاتانەی هاتوونەتە سەر كورسی حوكم كاریان لەسەر سڕینەوەو لاوازكردنی كردوەو ئەویش كارایی خۆی لەدەست داوەو بووەتە تاكێكی بێ خولیاو گۆشەگیرو بێ هیوا بەمافەككانی خۆی‌و گۆڕانكاری.. ئەو جۆرە لەئیش كردنی دەسەڵات بەدرێژایی مێژووی بوونی دەوڵەت لە عێراق دا وای كرووە، كەهیچ هیوایەك نەبێت بە گۆڕانكاری‌و بەرەوپێش چوونی كۆمەڵگا بەرەو ژیانی مەدەنی‌و دیموكراسی، چونكە دەسەڵات گۆڕین بەشێوەیەكی دیموكراسیانەو بەشداری كردنی هاووڵاتیان لەشێوازی

حوکم دا بوونی نەبووەو هەموو دەسەڵاتەکانیش کە دەستوریان دارشتوە، لەسەر بنەمای سزادانی هاوڵاتیان دایان ڕشتووە، نەك پاراستنی سەروەریی‌و ماف‌و ئازادیەکانی هاوڵاتیان... بۆیە تاك لەم کۆمەڵگایەدا هیچ بەشدارییەکی کارای نەبووە لەسەر دیاری کردنی دەسەڵات‌و جۆری دەسەڵات‌و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو تاك تەنها فەرمانی جێبەجێ کردوە... دیارە ئەم جۆرە لەبەڕێوەبردنی حوکم لە عێراق داو بێ دەنگ کردنی هاولاتیان لەخۆنەهاتوە، بەڵکو مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیەو سەرچاوەی لە عەقڵیەتی خێڵەکی‌و پیاوسالاری ئایینی‌یەوە وەرگرتووە، نەوە دوای نەوە درێژ بووەتەوەو کاریگەری خۆی لە عەقڵیەت‌و سایکۆلۆژیەتی تاکەکاندا بەجێ هێشتووە... لەسیستمی ئایینی‌و خێڵەکی دا تاك دەبێت ملکەچی فەرمانەکانی گەورە بێت‌و بەهیچ شێوەیەك نابێت لە فەرمانەکانی گەورە دەربچێت، چونکە سزای لەسەرەو شکاندنی پیرۆزیەکانیشە، بۆ نمونە لە دەسەڵاتی شمولی ئایینی دا نابێت هیچ کەس لە فەرمانی خەلیفەو یەکەکانی تری دەسەڵاتی ئایین دەربچێت‌و یاخی بێت، خۆ ئەگەر تاکێك ئەو کارەی کرد ئیتر مافی ژیانی نییەو دەبێت بکوژرێت... ئەو عەقڵیە لەعێراق دا دەقاودەق بەدرێژایی دەسەڵاتی ئایین‌و دواتریش دەسەڵات‌و حوکم ڕانە یەك لەدوای یەکەکان جێبەجێ کراوەو مافەکانی تاکی پێ زەوت کراوە.. هیچ دەسەڵاتێك لەعیراق دا بەهەڵبژاردن‌و بەشداری هاوڵاتیان نەهاتوەتە سەر کورسی حوکم‌و هیچ یەکێك لەدەسەڵاتەکانیش جێگای خواست‌و مافەکانی هاوڵاتیان نەبووەو هەموویان بەجۆرێك لەجۆرەکان سزای هاوڵاتیانیان داوەو ماف‌و ئازادیەکانیان پێشێل کردوە، ئەو جۆرە لەدەسەڵات هەموو ئەزموونەکانی حوکم ڕانی لەعێراق دەگرێتەوە، هەر لەدەسەڵاتی پاشایەتییەوە تا دەسەڵاتی بەعس‌و هەمووشیان هەڵگری جۆرەها

شێوازی ئەشکەنجەدان‌و سەرکوت بوون لەدژی هاوڵاتیان‌و هەموو دەسەڵات‌و پیرۆزیەکانیان لە خۆیاندا کۆکردوەتەوە ئەوانەش هەمووی دژی کرانەوەو ئازادی تاکەکان بووەو ڕێگاگرتنیش بوو لە هۆشیاری بوونەوەی هاوڵاتیان بەماف‌و ئازادیەکانیان. بۆیە تاکی عێراقی بەهیچ شێوەیەك خاوەنی بڕیار نەبووەو هیچ ئەزمونێکیشی نییە لە بەشداری کردن لە پرۆسەی هەڵبژاردن‌و مافە دیموکراسیەکان.. ئەوە وای کردووە هاوڵاتیان لە عێراق دا بەردەوام لەترس‌و دڵەڕاوکێ دا ژیابن‌و نەیانتوانیبێت هیچ هەنگاوێك بنێن بەرەو دیموکراسیەت. بەردەوام گوێ ڕایەڵی فەرمانی دەسەڵات بن، چونکە کۆی دەسەڵاتەکانی عێراق بەخوێن ڕشتن‌و کودەتا هاتوونەتە سەر کورسی دەسەڵات‌و هیچ کاتێك بوار نەدراوە بەهاوڵاتیان بیر بکەنەوەو بەشداریان هەبێت لە بواری سیاسی داو، هەر دەسەڵاتێك هاتبێتە سەر کورسی حەکم چالاکی هەموو گروپ‌و حزبەکانی قەدەغە کردووەو هەموویانی سەرکوت کردوەو ڕێگەی نەداوە بەشداری ژیانی سیاسی بکەن‌و ڕەئیان هەبێت... ئەو ئەزموونە تاڵەی شێوازی حوکم ڕانی لە عێراق دا کۆمارێکی لە ترس دروست کردوەو تائێستاش دوای سێ ساڵ ڕووخاندنی دەسەڵاتی کاریزمی بەعس هاوڵاتیان لەترس‌و گومان دا دەژین‌و بەو پەڕی ترس‌و گومانەوە لە ئاییندەی دامەزراندنی دەسەڵاتی نوێ دەڕوانن، لەگەڵ ئەوەی هاوڵاتیان بەشداری هەڵبژاردنیان کردوە بۆ دیاری کردنی دەسەڵات‌و دەستور، بەڵام ئەو بەشداری کردنەشیان نەیتوانیوە کەمترین کاریگەری هەبێت لەسەر سایکۆلۆژیەتیان‌و گۆڕانکاری بەسەر عەقڵیەتیان دا بهێنێت‌و لەو ترس‌و دڵەڕاوکێیە ڕزگاریان بکات‌و ئەکتڤیانە بەشداری ژیانی سیاسی بکەن.

هەڵبەتە ئەزموونی زیاتر لە 80 ساڵ لەسەرکوتو چاندنی تۆوی ترس‌و دڵەڕاوکێ لە ناخی هاوڵاتیان دا، بەئاسانی کۆتایی نایەت، بەتایبەت دوای ئەو گۆڕانکاریانەی لە عێراق دا ڕووی داوە، بەڵام عەقڵیەتی کاریزمایی حزبەکانی ئێستای سەر ساحەی سیاسی، وەك ئەوانەی پێش خۆی وایەو بەعەقڵیەتی نەفی کردن‌و گوێ نەگرتن کار دەکەن، سەرباری ئەوەی دۆخی سیاسی عێراق زۆر نائارامەو تیرۆر تۆقاندن‌و شەڕی مەزهەبی بوونی هەیەو ڕۆژانە کاری توندو تیژی‌و تۆقاندن‌و شەڕی مەزهەبی بوونی هەیەو ڕۆژانە کاری توندو تیژی‌و تۆقاندن ئەنجام دەدرێت، ڕەنگە ئەوەش هۆکارێك بێت بۆ ئەوەی هاوڵاتیان نەتوانن دەست بەرداری ترس‌و دوو دڵی بن‌و چالاکانە بەشداری ژیانی سیاسی بکەن، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆ کاریگەری بە ژیانی ڕۆژانەیانەوە هەیە...

کۆمەڵگای عێراق ئێستا بەو شێوەیە بەژیانی سیاسی دا تێپەڕ دەبێت، کە پێویستی بە گۆڕأنکاری هەیە بەرەو کۆمەڵگایەکی مەدەنی‌و دیموکراسی‌و، بەڵام تائێستا سەرەتای ئەو گۆڕانکاریانە بەدەر نەکەوتوە، چونکە هاوڵاتیان نەهاتونەتە مەیدانی ململانێ لەگەڵ دەسەڵات‌و کۆنخوازی داو بگرە ئیستا مل ملانێکان لەنێوان باڵەکانی کۆنخوازو دژە دیموکراسی‌و مەدەنیەکان دایەو شەڕیان لەسەر ئەوەیە کە چۆن دەسەڵاتێکی مەزهەبی‌و دەستورێك دابمەزرێنن کە ئایینی ئیسلام بنەمای سەرەکی ئەو دەستورە بێت‌و ئەمەش لەو دەستورەی کە ڕاپرسی لەسەر کرا بەرەسمی ناسێنرا، بۆیە گۆڕانکاری بەئاراستەی کرانەوەو پێشکەوتن‌و مەدەنیەت زۆر لاوازەو ، ڕێکخراوو گروپە پێشکەوتوخوازو علمانیەکانیش لاوازن‌و کاریگەری زۆریان نییە لەسەر هاوڵاتیان‌و ئاراستەکردنیان بەرەو گۆڕانکاری... ئەوە خاڵی ترسناکی ژیانی سیاسی

ئێستای کۆمەڵگای عێراقەو هاوڵاتیانیش جۆرێك خۆیان دوورەپەرێز گرتوەو نەهاتونەتە مەیدانی ژیانی سیاسیو ڕۆڵی کارا بگێڕن بەئاراستەی گۆڕانکاری بەرەو گەڕاندنەوی سەروەری بۆ هاوڵاتیانو کاراکردنیان لە بەشداری کردنی ژیانی سیاسی بە ئاراستەی مەدەنیو دیموکراسی.. چونکە بەشداری کردنی هاوڵاتیان لە هەڵبژاردن بەو مانایە نەبووە کە مافو ئازادیەکانی خۆیانیان تیا بینیی وەتەوە، بەقەدەر ئەوەی بەشوێن خواستی حزبو خێڵەکانەوە بوون، زۆر جاریش ئەو حیزبو خێڵانە هیچ بەرنامەیەکی دیاری کراویان پێنەبووە بۆ گۆڕانکاریو باش کردنی ژیان، بەقەدەر ئەوەی خۆیانو سەروەریەکانی خۆیان باس کردوەو، ئەمەش لەکۆی ئیدیعای هەڵبژاردەکان دا بەڕوونو ئاشکرایی دەبینراو سەرباری بوونی تەزویرکردنو کڕینی دەنگی هاوڵاتیان بەپارەو.. هتد، بۆیە ناتوانین بڵێین هەڵبژاردنەکان لە عێراق زادەی دیموکراسی بووەو هاوڵاتیانیش لەباوەڕبوون بە مافو ئازادیەکانی خۆیان بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردنیان کردوە، بەڵکو ئەوان بەپێی سوودو قازانجی حزبەکان بەشداریان کردووە، چونکە ناکرێ دوای سێ جار لە بەشداری کردنیان لە هەڵبژاردن کەمترین گۆڕانکاری بەسەر ژیانیان دا نەهاتبێت، جگە لەوەی بەشێکی زۆر لەو هاوڵاتاینەی بەشداری هەڵبژاردنەکانیان کردووە بەماوەیەکی کەم دوای هەڵبژاردن پەشێمان بوونەتەوە، لەبەشداری کردنیانو بەشێکی زۆریش دوور لە خواستو ئیرادەی خۆی چووەتە پرۆسەی هەڵبژاردنو بەپێی خواستی باوك یاخود خێڵو حیزب بووەو زۆرێکیش هەر نەی زانیوە بۆ دەبێت دەنگ بدات بە لیستیك، یاخود حیزبێك، بەڵکو لەسەرو خۆیەوە بۆی دیاری کراوە، کە دەبێت دەنگ بەو لیستە بدات، یان ئەو حیزب بدات، بەبێ ئەوەی هیچ

بەرژەوەندیەکی خۆی تیا بووبێت یاخود بەشداری کردنی هەنگاوێك بێت بۆ گۆڕانکاریو پێشکەوتن.

بەشداری کردنی هاوڵاتیان، لەدەنگ دا بۆ دەستوریش هەر بەو شێوەیە بەڕێوە چووەو، هاوڵاتیان زۆرینەی ئەوانەی دەنگیان بەدەستورداوە، دەستورەکەیان نەخوێندوەتەوە هیچ ئاگاییەکیان لەبارەی بەندەکانی دەستوورەوە نەبووە لەکاتێك دا دەستوور یەکێکە لە گرنگترین ڕەکیزەکانی دەوڵەتو ئیدارەو ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی هاوڵاتیان بەدەسەڵاتەوەو دیاری کردنی ئەرك‌و مافەکانی هاوڵاتیانەو سنووری ئازادیەکانە، بەڵام هاوڵاتیان بەبێ ئەوەی خوێندنەوەیان بۆ ئەو دەستورە هەبێت چوون دەنگیان پێداوە... ئەوەش یەکێکە لەو خاڵە ترسناکانەی، کە دواتر دەبیتە هۆکاری دروست بوونی کاریزماو دیکتاتۆریەت‌و هاوڵاتیانیش هیچ گوێ پێ نادەن‌و وەك کارێکی ڕۆتینی سەیری دەکەن... بەڵام دەبێت ئەوەشیان لەبەرچاو بێت کە دواتر خۆیان بەدەست ئەو دەستوورەوە گیر دەخۆن‌و حوکم بەسەریاندا دەدرێت.

بەهەرحاڵ خەڵکی عێراق نە ئەزموونی لە حوکم ڕانێتی پڕ توندوتیژی ڕابوردوو وەرگرتووەو، نە گرنگی بەداهاتوش دەدات، ئەوەش وا دەکات، کە بەشداری کردنی هاوڵاتیان لە هەڵبژاردنەکان دەر ئەنجامێکی ئەوتۆی لێ نەکەوێتەوەو ناشتوانین بڵێین ئەو بەشداری کردنە بەرچاوەی هاوڵاتیان لە هەڵبژاردن لەباوەڕبوون بە دیموکراسیەت‌و ئەگەری گۆڕانکاریەوە بووە، بەڵکو کارێکی ڕۆتینی‌و دووبارە بوەوەو هیچ گریمانەیەکی لە پشتەوە نەبووە... بۆیە ئەگەر داهاتووی عێراق بەم ئاراستەیە بڕوات ئەوا بەدڵنیایی ئەگەری گۆڕانکاری زۆر لاواز دەبێت‌و ناتوانین هەنگاو بەرەو دیموکراسی‌و

بەدەست هێنانی ماف‌و ئازادیەكان بنێین‌و ژیانی سیاسی لە عێراق هەر بەشێوە كاریزمایی‌و تەقلیدیەكەی ئێستای دەمێنێتەوەو هاوڵاتیانیش جارێكی تر دەكەونەوە بەردەم ترس‌و هەڕەشەی كوشتن‌و بێ دەنگ كردن، بۆیە ئێستا كاتی ئەوەیە هاوڵاتیان بەو پەڕی جدیەوە بەشداری ژیانی سیاسی بكەن‌و بەبێ ماف‌و ئازادی‌و سەروەریەكانی خۆیان هەوڵی گۆڕینی دەسەڵات‌و دەستوور بدەن بە قازانجی خۆیان‌و خۆیان ببنە بڕیار دەر لەسەر چارەنوسی خۆیان‌و دەسەڵات‌و دەستورێك بنیاد بنێن، كە تەواوی مافە مەدەنی‌و دیموكراسیەكان لەخۆی بگرێ‌و ڕێگای لە دووبارە بوونەوەی دیكتاتۆریەت‌و دەسەڵاتی تاك ڕەهەندی بگرن، چونكە كەشی سیاسی ئێستای عێراقی زۆر ئاڵۆزو نالەبارەو دەكرێت هاوڵاتیان بیگۆڕن، بەئاراستەی پێشكەوتن‌و دیموكراسیەت، بەڵام ئەو بێدەنگی‌و دوورە پەرێزیەی هاوڵاتیان، لە ئەنجام دا دەسەڵاتێكی سەركوتگەر دێتە بەرهەم‌و كۆی ژیانی هاوڵاتیان دەكەوێتەوە بەرمەترسی، ئەم ئەگەرەش پەیوەندی بە خودی هاوڵاتیان خۆیانەوە هەیە تا چەند جدی دەبن لە كاركردن بۆ گۆڕانكاری بە ئاراستەی مەدەنیەت‌و دیموكراسی.

## ژن لە کەلتوری ئێمەدا

ئەگەر لە دەرەوەی کەلتورە فراوانەکەدا کە کوردو نەتەوەکانی دەوروبەریشی بە پێی چوارچێوە ئایینیەکە لە خۆیدا گرێ دراوە, تەماشای ژن بکەین سەرەڕایی بەکەمتر تەماشاکردنی لەلایەن پیاوەوە, بەڵام لە کۆمەڵگەی کوردیدا ژن جۆرێك لە ئازادیان هەبووە, کە لە ناو نەتەوەکانی دیکەدا کەمتر بووە ڕۆژهەڵات ناس و کورد ناسەکان بەشێکی زۆریان لە سەر ئەم مەسەلەیە کۆکن(بڕوانە گەشتەکەی ریچ و بیروبۆچونەکانی مینۆرسکیو هتد) ژنی کورد یان فراوانتر ژن لە کۆمەڵگای عێراقیدا بەهەمان ئەو فۆڕم و چوارچێوانەی پیاو سالاریەوە پەیوەست بوەو ئاوڕدانەوە لە مێژوو ئێمە ڕووبەڕووی دەیان پەندو بەیت و بالۆرە دەکاتەوە کەلەسەر کەم بایەخی ژن داهێنراون, بۆنمونە پەندێکی کودی هەیە دەڵێ " پیاو کەڵەبابە لە سەر ژنێ حسابە " واتە پیاو خاوەن و بڕیاردەرە بەسەر ژنەوە, بەبێ جیاوازی نەتەوەکانی نێو چوارچێوەی عێراق ژن بەلاوازو کەم ئاوەزوو زەعیفە ناودەبەن بەکارهێنانی ووشەی " زەعیفە " کە ڕۆژانە دووبارەو سەدبارە دەبێتەوە گەورەترین سوکایەتیە بە ژنان, زەعیفە واتە کەم دەسەڵاتو دەستەپاچە, ئەم باوەڕە لای خودی ژنانیش هەیە, واتە ئەوان خۆشیان وا بەخۆیان دەڵێن, ئەمەش پەیوەندی بەو کەلتوری پەروردە کۆمەڵایەتیو ئایینیەوە هەیە. کە کۆمەڵگای ئێمەی تێدا لە قاڵب دراوە, کۆمەڵگەو ئایین ڕۆڵێکی گەورەیان لە دەستەمۆکردن و گوێ ڕایەڵی ژنان بۆ پیاوان گێڕاوە, کەلتوری بەکارهێنانی زەبرو زەنگو لێدانو تەمبێ کردن لە هەناوی هەریەك لە ئایینو کۆمەڵگەوە سەری دەرهێناوە, کۆمەڵگەو ئایین هەمیشە ژیان وا بارهێناوە کە دەبێ کەم دوو، ئاقڵو

گوێ ڕایەڵ‌و دەستەمۆ بێت, پێوەرەکانی ئەم وابارهێنانە بریتی بونە لە بەشداری نەکردن لە دانیشتنەکانی پیاودا, لە ژوورەوە قەتیس کردنیان, لێ حەرام کردنی دیوەخان لە ژنان, دیاری کردنی ئایندەو چارەنوسیان لەلایەن پیاوانەوە, ئەمەش وایکردووە کە زۆر دەگمەن مافی بەشداری تەنانەت لە دیاری کردنی چارەنوسی خۆشیدا هەبێت, تائێستا دیاردەی ژن بەژن بە کچی یەکدی لەلایەن ئەو بێوە پیاوانەوە کە ژنەکانیان مردووە, دیاردەی بەشوودان بێ ئەوەی بوك یان کچ هاوسەر یان زاوا ببینێ, دیاردەی کچ بەزۆر بەئامۆزاو خاڵۆزاو کەسوکار بەشودان باوی هەیەو تەکنۆلۆژیاو ئاستی پێشکەوتن‌و کرانەوەی کۆمەڵگا نەیتوانیوە بەڕادەیەکی بەرچاو پاشەکشە بەم دیاردانە بکات, ئەمە جگە لەوەی ژن وەك ئەسپ‌و چەك‌و خانوو بە حسابی کاڵا کڕین‌و فرۆشی پێوەدەکرێ‌و لە کێشەو گیروگرفتیشدا بۆ چارەسەرو ئاشت بوونەوە دەبەخشرێ, ئێمە نمونەمان لە پێشکەوتوو ترین شاری عێراق کە سلێمانی یە لەبەردەستە چۆن بۆ چارەسەری کێشەی کوشتنێك دوو کچ دەکرێنە قوربانی, لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ئەمە نمونەی زۆرەو کەلە نێوان دوو بنە ماڵە یان خێزان‌و خێڵدا شەڕ یان گیرو گرفتێ ڕوودەدات بۆ چارەسەر ژن و پارە بەکاردەبەن و ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتیە بەڕادەیەك زاڵە کەتەنانەت حیزبە سیاسیەکان‌و یەکەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیش هەندێ جار ملکەچی ئەو بڕیارو ئاشتبونەوانەن ژن لە بیرو باوەڕی ئێمەدا لە خراپترین پەراسوی پیاو دروستکراوەو هۆکاری نەهامەتی و قوڕبەسەری هەمیشەیی بەشەریەتەو سەرەتای دەرکردنی ئادەم لەبەهەشت هۆکارەکەی حەوایە کە ژنەو سەرەتای شەڕی بەشەریەت لەنێوان هابیل‌و قابیل دا لەسەر ژنە, بەدەر لەسەرجەم ئەم بیرو بۆچونانە دروستکردنی ژن بەشێکی زۆری بۆ هاودەنگی پیاو لەزەت لێوەرگرتنێتی,

بۆیە کەلتورە ئاینیەکەمان ڕێگای بە پیاوان داوە تا چوار ژن لەیەك کاتدا بهێنن, ئەمەش بۆ ئەوەی لەم لەزەتە جنسیە بێبەش نەبن, لەلایەکی دیکەوە هەمیشە ژنهێنان و هاوسەر گیری بەنیوەی ئیمانەکە زانراوە(فەرمودەی محەمەد(د.خ) کە دەڵێ گەنج نیو ئیمانەو بەژنان هێنان ئیمانەکەی تەواو دەبێت) ئەمەش بەشێکی زۆری گەڕاوەتەوە بۆ لەزەتەکە, ژن لە کۆمەڵگەی ئێمەدا جگە لە سەرکوت کردن, بەکەم تەماشاکردن, بەکاڵاکردنە هەمیشە حەیاو شەرەف و کەرامەت و ئەو مەسەلانەی پێەوەگرێ دراوە و یەکەمین قوربانی بووە ئەگەر بەهەڵەیەك هەڵسابێت و کەمتر هەمان سزا بەسەر پیاودا دراوە, لە کەلتوری خێڵەکی خێڵە عەرەبەکانی پێش ئیسلامدا باوی ئەوەبووە کە خێڵێك داویەتی بەسەر خێڵێکی دیکەدا ئەتکی کچان و ژنانی ئەو خێڵەی کردووەو لەگەڕانەوەیاندا زۆربەی کچانی خۆیان لەترسی هەڕەشەی بەرامبەر زیندەبەچاڵ کردووە (بڕوانە بیروبۆچوکانی هادی عەلەوی‌و ئیسلامناسیی ئەمیری میرڤێتروس‌و سەرچاوەگەلی دیکە) هاتنی ئیسلام ئەگەرچی زیندەبەچاڵەکەی نەهێشت بەڵام نەیتوانی تاماوەیەکی دوور دیاردەی بەتاڵان بردن‌و ئەتك کردنی ژنان لە پەلامارەکانی سوپای ئیسلامدا بەر پێ بگرێ, لە کەلتوری ئێمەدا ژن زۆر کەم بواری هەناسەدانی بۆ هەڵکەوتووە, زۆرکەم وارێکەوتووە کە ژنێکی نمونەیی دەسەڵات بگرێتە دەست نمونەی مەستورەی ئەردەڵانی‌و حەپسەخانی نەقیب و ناوگەلی لەوبابەتە, لەوانەن کە توانیویانەبەشێکی زۆر لە کۆت و بەندو دیوارەکانی کەلتور بڕوخێنن بەڵام هەرگیز نەیانتوانیوە ئازادی خۆیان بەرادەی ئازادی پیاو فراوان بکەن و بەردەوام لە پشتیانەوە هێزێکی پیاوان هەبووە کەئەمەش لە کەلتورە کۆمەڵایەتی‌و ئاینیەکەوە سەرچاوەی گرتووە, بۆ نمونە

کەلتوری ئاینی ئێمە هەرگیز ڕێگای بەژنان نەداوە ببنە گوتار بێژی ئاینی‌و پێش نوێژی و وتارخوێنی بکەن ئەمە هەر لەبەرئەوەی کە ئەو مەقام و شوێنە بۆ پیاوانەوبەس لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە هەرگیز ئەو ئازادیەی بۆ کوڕان فەراهەم بووە بۆ کچان فەراهەم نەبووە, هەر لە منداڵیەوە کچان ڕووبەڕووی هەڕەشەی توندی دایك دەبنەوەو بەردەوام لەوە ئاگادار دەکرێنەوە کەپێوستە زۆر ئاگارداری خۆیان بن, نابێ ئەو گەمەو یاریانە بکەن کە کوڕو براکانیان دەیکەن, نابێ وەك کوڕان بچنە دەرەوە, بیر لەیاری کوڕانە بە پێوەری کۆمەڵگە بکەنەوە, هەر لە منداڵیەوە ئەم ڕێ‌و شوێنانە لەڕوی دەرونی‌و کۆمەڵایەتیەوەکاریگەری خۆی دەبێت لەسەر کچان, سەرچاوەکانی شەرم کردن, نەتوانینی ڕووبەڕوو بوونەوە, کەم دوویی و خۆپارێزی لە وێوە دەسپێدەکەن, نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێت کە کۆمەڵگەی ئێمە لە دایك بوونی کچ بە ڕادەیەکی زۆر بەمایەی نەهامەتی دەزانێ و هەمیشە ناتوانێ کچ وەك کوڕ لە خێزاندا تەماشابکرێ‌و تەنیا کوڕ بە درێژەپێدەرو مانەوەی بنەماڵەو بەردەوامی تەماشا دەکرێ‌و لەسەروەت و سامانی بنەماڵەدا بەردەوام نیوەی ئەوە وەردەگرن کە کوڕان وەری دەگرن, ئەمەش هەردوو کەلتوری ئاینی‌و کۆمەڵایەتی لەسەری کۆکن, کەلتوری ئێمە لە بەرامبەر زەبروزەنگی پیاودا هەڵگەڕانەوەی ژن بەکارێکی نەشیاو نەکردە دەزانێ‌و ڕێزگرتنی پیاو لە ژن و هاوسەر بۆ پیاو مایەی کەم بایەخیەو بەسەرژنانی ناودەبەن, ئەم کەلتورە کەلتوری سڕینەوەو کەم بایەخ کردن و پەراوێز خستنە, بۆیە باشترین چەکی ڕووبەڕوو بوونەوەی ژنان‌و ئافرەتان لەم کۆمەڵگایەدا گریانە جێی خۆیەتی لێرەدا بەکورتی ئاماژە بە ڤێزەونیەکی دیکەی ئەو کەلتورە بدەین کە بەداخەوە تائێستا ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی‌و ژنان‌و ئافرەتان

پەیان پێ نەبردووە یان قسەی جدیان لەسەر نەکردووە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ژنان هەر ئەو نەهامەتیە زۆرو زەوەندەیان نیە کە ئێمە وەك سەرە قەڵەم لەم نوسینەدا قسەی لەسەر دەکەین, بگرە لەشەڕی نێوان کوڕان‌و پیاواندا لە ڕووبەڕووبوونەوەدا زۆرترین ئەو جنێوە باوانەی کە لەم کۆمەڵگەیەدا دەدرێن ڕووبەڕووی ژنان دەدرێن, تەنانەت ئەو جنێوانەش کە ئاڕاستەی پیاوان دەکرێن پەیوەندیان بە ژنانەوە هەیە, کەواتە لەم کەلتورەدا ئەوەی کەناوی بوونە بۆ ژنان هیچ مانایەکی نیەو ژن جگە لە دیاریەك لە خوداوە بۆ پیاو هیچی دی نیە, بۆیە دەبینین جل‌و بەرگی ئاڵ‌و واڵا خۆجوانکردن‌و خۆڕازاندنەوە بۆن‌و بەرامە لە خۆدان‌و مێخەکبەندوئاڵتون‌و هتد, ئەو شتانەن کە بەشیاوی ژنان زانراون, ئەمەش نەك لەبەر بایەخی ژن بونیان بگرە لەبەر ئەوەی کە چاکتر ئاسودەیی بە پیاوان ببەخشن, کەلتوری پیاوسالارانەی ئێمە مافی عیشق‌و خۆشەویستی لە کچان‌و ئافرەتان داگیرکردووەو هەردەم بەلای کەس‌وکاری کوڕانەوە مایەی بەختەوەری و گەورەیی بووە کوڕەکەیان کچ بازی کردبێت و گەیشتبێتە قۆناغێ کە کچان ڕام بکات, بەڵام بۆ کچەکانیان ئەگەر عیشق‌و خۆشەویستی ڕاستەقینەش کرابێت, ئەم مەسەلەیە هەرمایەی سوکایەتی‌و سەرشۆڕی بووە, لە بواری خوێندن‌و پەروەردەشدا کچان زۆر درەنگ ئەو بوارەیان دراو تا سەرەتای حەفتاکانی سەدەیی بیستەمیش لەزۆر شوێن بە عەیبێکی گەورە دەزانرا کچان بخوێنن‌و دەیانگوت کچ خوێندنی بۆ چیە, ئەمە جگە لەوەی کە تائێستا ڕێگا نادرێ یان زۆربەی خێزانەکان ڕێگا بەکچەکانیان نادەن لە دەرەوەی ئەو شارەی تیایدا دەژین, درێژە بە خوێندن لە زانکۆو کۆلیژەکان بدەن, بەگشتی ئەم کەلتورە کە کەلتورێکە داهێنراوی پیاوەو لە پەندو بەیت‌و حەکایەتدا بەسەدان شێوە سوکایەتی بەژنان کراوە کە

تائەم چرکە ساتەش بەرادەیەکی زۆر بێ مانایيان لێ دەچۆڕێ‌و شیاوی ئەوەنین هەر بلاوبکرێنەوە, هەر بۆ نمونە دەکرێ ئاماژە بەوەبدەین کە تا ئێستا لەبەشێکی زۆری کۆمەلگە تەواو داخراوەکاندا ژن‌و سەگ بەیەك چاو تەماشا دەکرێن‌و ئەگەر دایکێك لە کچەکانی تورەبێت پێیان دەلێ "دەلەشر" واتە لە سەگیش کەمتر, ئێمە کە پێشتر بەبەراورد ووتمان ژنی کورد لەوانی دیکە باشترو لە عێراقیشدا دەشێ لەگەل ولاتە عەرەبیەکاندا دۆخەکە دۆخێکی باشتربێت, ئەمە پەیوەندی بەو مێژووە دوورو درێژەی عێراقەوە هەیە لە بواری گۆرانکاریدا بۆ نمونە ئەوەی لە سعودیەو کوەیت بەرابەر ژن هەیە زۆر جیاوازە لە عێراق لە عێراقیشدا تا بەرەو باشور برۆین هەستدەکەین دۆخەکە تاریکترە بۆ نمونە کوردستانەکەی "باکوری عێراق" زۆر باشترە لە ناوەندو, ناوەند لە باشور" بەشە عێراقە عەرەبیە شیعەکە" باشترە ئەمە ئەگەر کەسێك بەووردی لە بارودۆخەکە بروانێ ئەوەی بۆ روون دەبێتەوە ئەگەرچی دیاردەی سێکسبازیەکە پێچەوانەی ئەم دابەشکردنەیە بۆ نمونە بە پێچەوانەی نەبوونی ئەو دیاردەیە لە بەشە کوردستانەکەی عێراق لەناوەندو باشور زۆرە, تۆژەرو ئەو لێکۆلکارانەی کەدێنە عێراق ئەگەر بەوردی تەماشای بارودۆخی ژنان بکەن درك بەجیاوازیەکی زۆر قول دەکەن لە نێوان هەردوو رەگەزدا, ئەمە جگە لەو زەمینە رەخسانە جیاوازەی لە کۆمەلگەدا بە جیاوازی زۆرەوە بۆ هەردوو رەگەزەکە فەراهەم دەکرێ, ئەم کەلتورە کەژنی لەو تاریکیەدا هێشتۆتەوە بەرادەیەك کاری کردوەتە سەر باری دەرونی‌و کەسێتی ژن کە هەردەم بواری هەناسەدانی بۆ برەخسێ یان لە تاریکیەکە بێتە دەرەوە نەزانێ چۆن مامەلە لەگەل ئازادی بکات جارەها ئەم دۆخەش لەلایەن پیاوانەوە قۆرخ دەکرێ, یان دەقۆزرێتەوە بۆ شکاندنی کەسێتی ژن, بۆ نمونە ئەو

ژنانەی کەلە تاریکیەکە دەربازیان دەبیٚ‌و دێنە دەرەوە پیاوان بە جۆرێکی دیکە بەدووی کۆیلەکردنیانەوەن, ئەمەش ڕێك لەو تێگەیشتنەوە سەرچاوەی گرتوە کەپێی وایە ژن لە پێناوی پیاودا دروست بووەو هیچی دیکە, دیارە چیرۆکە ئاسمانیەکان و ئەفسانەو حەکایەتەکانیش هەر ئەوە دەگێڕنەوە دواجار لە مێژوو ڕابووردووی ئێمەدا کەم ئەندامی بەهەموو شێوەکانیەوە بۆپیاوان گرفتێك نەبووەو هەرگیز ئەو کەم ئەندامیە ڕێگر نەبووە لەوەی کە هاوسەرگیری بکەن‌و بەئاسانی هاوسەری ژن دیاری بکەن, کەچی بۆ ژن ئەمە پێچەوانە بووە و ژنانی کەم ئەندام زۆر دەگمەن هەڵکەوتووە بتوانن هاوسەرگیری بکەن هەرگیز کەس ئامادە نەبووە هاوسەرگیریان لەگەڵ بکات.

## کەلتوری بەعس‌و مەسەلەی بەشداریکردنی سیاسی

### قەفەسی بەعس:

ئەو چوارچێوەو فۆڕمەی کە بەعس بۆ ئازادی نەخشەی کێشا بوو بواری هەناسەدانی بۆ کەسی دیکە ناهێشتەوە، حیزبی بەعس شەرعیەتی خاوەنداری‌و سەروەری‌و تاك ڕەهەندی بەخۆی بەخشی بوو هەر لێرەشەوە ئیدی ئەو جگە لەخۆی بڕوای بەبونی حیزبی دیکە نەبوو. ناونانی حیزبەکە بە "حیبزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی کۆکردنەوەی ناسیۆنالیزم‌و سۆسیالیزم بەشێوەیەکی دی بەپێی پێناسەی دامەزرێنەرانی حیزب. ئەم کۆکۆدنەوەیە جگە لە کارکردن بۆ سڕینەوەی ئەوانی تر هیچی دی نەبوو، ئەم قەفەسەی بەعس لەناو وڵاتێکی وەکو عێراقدا، تەنانەت بەبێ ڕێزگرتن لەو ناسنامە نەتەوەییە جیاوازانە بەعسی بونی جگە لەعەرەبی کوردو تورکمان‌و سریانی‌و ئەوانی دیکەشی کردبووە مەرجێکی پێش وادەو نابەعسیەتی لەوڵاتێکی وادا بێبەش کردن بوو لە هەموو ماف‌و بونێك، ئەگەر بەوردی تەماشای ئەو پەلکێشکردنە ترسناکە بکەین کە بەعس لەناو عێراقدا دەرهەق بەوانی دی کردویەتی لێرەوە لەوە تێدەگەین کە بەعس چ گەمەیەك بە بنەماکانی جیاوازی دەکات‌و چۆن دەیەوێ لەنێو بۆتەی بەعسی عەرەبیدا هەموو ئەوانی دیکە بسڕێتەوە، قەفەسی بەعس قەفەسی دەستەمۆکردن‌و لەزمان خستنی ئەوانی تر بوو، ئەم دەمکوتکردن‌و لەزمان خستنە بوونی ئەوانی دیکەی بەڕادەیەك بێ بایەخ کرد کە تەنانەت لەو ماوەیەشدا کە حیزبی شیوعی بەهاوبەشی لەگەڵ بەعسدا لە عێراقدا هاوپەیمانی‌و بەرەیان هەبوو، کەچی حیزبی شیوعی بەپێچەوانەی حیزبەکەی پەنجاکانەوە لە حەفتاکاندا جگە لە بونێکی

بێدەنگ‌و رەزامەند شتێکی تر نەبوو، ئەمە لەکاتێکدا پێدەچوو هەم بەعس لەبەر چاوی سۆڤیەت ئەو هاوبەشییە شەق‌و شڕەی پێ قەبوڵبێت هەم حیزبی شیوعی بەجۆرێك لە جۆرەکان دڵی سۆڤیەتی ئەوسەردەم رازی بکات، هەر بۆیە دەبینین کە حیزبی شیوعی رۆژ بەرۆژ زیاتر لە قەفەسی بەعسیەیکاندا بواری هەناسەدانی کەم دەبێتەوە بەناچاری پەنا دەباتەوە بەر شاخ‌و سەنگەری پێکەوە بوون لەگەڵ بەعس، لەگەڵ هێزێك کە کەسی دی، هێزی دی قبوڵ ناکات جگە لەخۆی. قەفەسی بەعس قەفەسی سڕینەوەی هەموو ئەوانەیە کە وەك خۆی بیر ناکەنەوە، بەعس جێ دەهێڵێ ویستی لەرێگای ئەم ئاماژەیەوە مافی بون‌و بیرکردنەوە لەهەموو ئەوانی دیکە بسەنێتەوە، ئەو سیاسەتەی بەعس لەماوەی دەسەڵاتیدا پیادەی کردن، چ لەسڕینەوەی ناوخودی خۆیدا چ لە سڕینەوەی دژەکانیدا زاڵکردنی کەلتورو تێگەیشتن‌و بەرنامەو رێبازی خۆی بوو بەسەر ئەوانی تردا، گوتارە ئاگرینەکانی سەدام حوسێن‌و پێشتر وتارەکانی بەکرو کۆی نامیلکەو تێزەکانی عەفلەق جەخت لەسەر راستی خۆیان‌و هەڵەیی ئەوانی دی دەکەنەوە، بۆیە بەعس دەیویست پەیامەکەی سنورەکانی نێوانە وڵاتە عەرەبیەکان ببڕێ‌و تادێ قەفەسەکەی فراوانتر بکاتەوە. لەسەرەتادا لەرێگای چاندنی تۆوی بەعس‌و پەرەدان بە بیری بەعسیزم‌و لەدەرەوەی سنورەکانی عێراق‌و سوریا بەئاراستەی لوبنان‌و فەلەستین‌و یەمەن‌و ئوردن‌و سودان‌و میسرو شوێنی دیکە. دواتر لەرێگای دروستکردنی حیزبی هاوشێوەو پاش ئەوەش لەرێی زەبرو زەنگەوە چ ئەوەی بەعسی سوریا لە لوبنان‌و لەناو وڵاتەکەشدا بەرابەر ئۆپۆزسیۆن‌و کورد بەتایبەتی پەیڕەوی دەکرد، چ ئەوەی عێراق لەپەلاماریدا بۆ سەر کوەیت پێی هەستا. لەراستیدا بەلای بەعسەوە، ئەو نەهامەتی‌و

پچڕپچڕییەی عەرەب پەیوەندی بە نەبونی حیزبێكی فریادڕەسەوە هەیە. حیزبێك كە بەگوتەی خۆیان سەركردایەتییەكی حەكیم‌و لێزان بەڕێوەی بەرێت، هەڵبەت لەدیدی بەعسیشدا دەبێ ئەو فریاد رەسە خۆی بێت نەك كەسی دیكە. ئەمە ئەو دیدگایەیە كە حیزبی بەعسی عەرەبی بۆ سڕینەوەو لەپەلپۆخستنی ئەوانی دی كاری لەسەر دەكرد، ئەگەر خوێندنەوەی بەعس بۆ ئەوانی دی ئەوە بێت كە دەبێت ملكەچ‌و ئەڵقە لەگوێی ئەوبن، وەك چۆن سوریا دەیویست لوبنان وابێت‌و عێراقیش سوربوو لەسەر ئەوەی گەر كوەیت‌و سعودیە بە ڕێگای ئاشتیانە وا نەبن بەدوای ڕێگای دیكەدا بچێت. خود پەسەندی بەعس بەشێكی دەگەڕێتەوە بۆ خودپەسەندی عەرەب، مرۆڤی عەرەبی بەبێ ئاوڕدانەوەیەكی ئاقلانە پێی وایە كە ئەو رەسەنترین‌و پاكترین‌و چاكترین مرۆڤەكانی سەر گۆی زەوییە، جارەها بوونی قورئان بە عەرەبی‌و پەیامبەری عەرەب‌و ئاماژەدان بەناوی خۆیان لەقورئاندا دەكەنە بەڵگەی ئەو مەسەلەیە، ئەم خود پەسەندیە ترسناكە هەمیشە دیكتاتۆرو دڕندە بەرهەم دێنێ بۆیە نیشانەی سەرسوڕمان نییە كە تێگەیشتنی بەشێكی زۆر لە تاكی عەرەبی بەرابەر ئەوانی دیكە تێگەیشتنی كۆیلەدارو كۆیلە یان ئاغاو وەرزێرە، ئەم بەبچوك روانینە ئەوانی دیكەیە لە ئەدەب‌و كەلەپورو بیروباوەڕی سیاسی عەرەبدا مێژوویەكی دوری هەیەو ئەو شانازییە لەرادەبەدەرو بێ بنەمایەی عەرەب بەخۆیەوە دەیكات دواجار لەهەناویدا حیزبی بەعسی عەرەبی‌و نمونە سەركردەی وەك سەدام حوسێن بەرهەم دێنێ، بەعس لەنێو هەناوی ئەم كەلتورەوە دێت قسە لەسەروەری‌و گەورەیی‌و تاك رەهەندی‌و بیر زاڵی خۆی دەكات‌و ئەمەش ئاوێتەی دیموكراسیەتی بەعسیانەو لەقاڵبدانی ئەوانی دیكە دەكات، دەشێ دیموكراسیەتی

بەعسیانە مایەی لەسەر وەستان بێت، بەو پێیەی بەعس خۆی پێ لەناوچەکەدا لەهەموو دیموکراسی تر بوو، ئەو ئۆتۆنۆمییەی کە لەکورستان هەبوو بەنمونەی ئەو دیموکراتیەتەی ناو دەبرد، ئەمە لەکاتێکدا لەپەنا ئەو دیموکراتیەتەوە کوشتو بڕی بونی دەکرد لە کوردستان.

### * بەعس‌و بەشداری ئەوانی دیكە:

بەعس بڕوای بە بەشداری كەسی دیكە نەبووە لە دەسەڵاتدا، بڕوای نەبووە بەو مانایەی شەرعیەتی نەداوە، نەك بڕوابون، تەنانەت لەهەندێك لەو قۆناغانەشدا كە لەهاوپەیمانێتی تێیدا بووە ڕێگای ئەوانی دیكەی بەجۆرێك بەرتەسك كردووەتەوە كە بواری هەناسەدانیان نەبێ، بۆ نمونە چ لەسەرەتای حەفتاكاندا لەگەڵ پارتی، یان لە كۆتای حەفتاكاندا لەگەڵ شیوعی، ئەمە جگە لە هەردوو باڵە وابەستەكەی پارتی‌و شۆڕشگێڕانی ناوخۆی، پێكهاتەو دروستبونی بەعس‌و هەڵكەوتەكەی وابووە كە لە بواری بەشداریدا ڕەوایی بەكەسی دی نەدات، لە بنەڕەتدا تێگەیشتنی بەعس بۆ بەشداری كردنی ئەوانی دیكە لە ڕێگای خۆیەوە بوەو بەس. واتە بەعس تا ئەوێ بڕوای بە بەشداری ئەوانی دیكە هەبووە كە لەچوارچێوەی بەرنامەو سیاسەتی خودی بەعسدا درێژە بە سیاسەت بدەن.

حیزبی بەعس سێ بنەمای سەرەكی بەهەند وەرگرتووە بۆ بەشداری كردنی هەر كەس‌و گروپ‌و لایەنێك، ئەو بنەمایانە بریتی بونە لە:

1- داننان بە ڕێبازو پرۆگرامی بەعسدا.

2- ڕووبەڕوونەبونەوە لەگەڵیداو ملكەچی بۆ سیاسەتی بەعس.

3- سیاسەتی باوك‌و فەرزەندانە، یان وەك باوك ڕوانینە حیزبی بەعس.

ئەم سێ بنەما ستالینیە پێش مەرجی حیزبی بەعس بووە بۆ هەر گروپێك كە بەعس ویستبێتی بەشداری پێ بكات، نەك ئەو بیەوێ لەگەڵ بەعس بەشداری بكات، چونكە مافی ویستنەكەش لای بەعس بووە نەك لای لایەنی بەرامبەر، لای بەعس سیاسەتی بەشداری پێ

کردن بەم سێ بنەما لەبەرچاو گیراوەوە بەعساندن بووە هەر بۆ نمونە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا بەعس تەنانەت لەناوخودی عێراقیشدا کە حیزبەکە دەسەلاتی رەهایی هەبوو کەچی مافی ناسنامەی نەتەوەیی لەوانی دیکە لە رێگای حیزبی بونەوە داگیر دەکرد. گەرچی ئەمە پێچەوانەی دەستورە کاتیەکەی ساڵی 1970 ی خۆیشی بوو بەو مانایەی کە دانی دەنا بە بونی نەتەوەی جیا جیادا لە عێراقدا وەك ئەو بەندەی کە دەیگوت عێراق لە دوو نەتەوەی عەرەبو کورد پێك دێت، کەچی لە پرۆسەی بەعساندنا کوردبونو تورکمان بون هەڵدەوەشایەوەو دەبوایە بڕیاری توانەوەی ناسنامە نەتەوەییەکەت لەرێگای چونە ناو حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیەوە بدایە، ئێمە ئەگەر ئاوڕ لە ژیانو سیاسەتی بەعس بدەینەوە تەنانەت لەناو خۆشیدا لەپێناوی خودپەسەندیو رەوایی دان بە باڵێکی ناوخۆیەوە هەستاوە بەسڕینەوەیەکی ترسناك، بۆ نمونە لەداردانی محەمەد عایشو هاوڕێکانی کە نزیکەی یەك لە چواری سەرکردایەتی حیزب بون لە کۆتای حەفتاکاندا، یان سڕینەوەی بنەماڵەی سەدامو حوسێن کاملو سڕینەوەی سەدان ئەندامو هەواداری خودی بەعس. ئەو رستەو گوتارو نوسینە ترسناکانەی عەفلەقو بەکرو سەدامو بەرپرسانی ئەو حیزبە لەکۆنو نوێ دا ئەو راستییە بەتەواوەتی ئاشکرا دەکەن کە بەعس بەهیچ جۆرێك بڕوای بەبەشداری کەسی تر نەبووە، دۆزینەوەی بیانوش بۆ لەناودان بەلای حیزبی بەعسەوە کارێکی زۆر ئاسان بووە، ئەو سەرچاوانەی بەعس بنچینەکانی بیروباوەڕی خۆی لەسەر داڕشتووە بریتیی بوون لە:

أ- عەرەبایەتیو سود وەرگرتن لە ئایینی ئیسلام بۆ بەرژەوەندی خۆی، ئەگەرچی بەعس لەبنەڕەتدا ئاینی ئیسلامی وەك هۆکارێك بۆ

فرپیودان ئاوێتە کردووە. بەڵام لە رێگای ئاینەکەوە بیروباوەڕی عروبیەتی سەپاندووە، عروبیەت‌و عەرەبایەتی بە بنچینەی سەرەکی هاتووە لای بەعس گێڕانەوەی ژیانەوە بۆ عەرەب‌و ناونانی حیزبەکە بە حیزبی ژیانەوەی عەرەبی لەو روانگەیەوە بووە، واتە لە بنەڕەتدا بەعس پێی وابووە ئەو پرش‌و بڵاویەی عەرەب مانای لەدەست دانی ژیانی عەرەبایەتی بووە، بۆیە گێڕانەوەی ژیان تەنیا لەرێگای حیزبایەتی وەك حیزبی بەعسەوە دەبێ.

ب- سودوەگرتن لەنازیزم‌و ستالینیەت، رەسەنایەتی، پیرۆزی، رەوایی، ئەو زاراوانەی کە بەردەوام بەعس دەگەڕێتەوە سەریان، بەعس بەپێی بیروباوەڕو گوتارە سیاسیەکەی پێی وایەو پێی وابووە عەرەب رەسەنترین‌و پیرۆزترین بونەوەرە لەسەر گۆی زەوی، هەڵبەت عەرەبێکی بەعسی لەو چوارچێوەیەدا کە بەعس قەبوڵێتی، چونکە ناکرێ بڵێین بەعس بەهەمان چاو سەیری عەرەبی نێو حیزبی دەعوەی دوژمنی سەرسەختی خۆی کردووە، کە رەسەنایەتی‌و پیرۆزی لای عەرەب بێت کەواتە رەوایی دەسەڵاتدارێتی‌و بەڕێوەبردن‌و حکومەتکردن هەر بۆ عەرەبە. ئەم لێکدانەوانە، هەمان لێکدانەوەی هیتلەرو نازین. نازیەکانیش زۆر جەختیان لەرەسەنایەتی‌و پیرۆزی‌و رەوایی دەکردەوە، ئەو زەبرو زەنگەی کە بەعس دژی نەیارەکانی بەکاری دەهێنا ئەمەش لەو سیاسەتەی ستالینەوە سەرچاوەی گرتبو. رەنگە ئەو جۆرە لە کوشت‌و بڕو زیندانیکردن‌و دورخستنەوەو لەناو دانەی کە بەعس پیادەی دەکرد. زۆر نزیك‌و هاوشێوەی ئەوە بێت کە ستالین پیادەی دەکرد.

**بەعس و پرسی ژن:**

بەدرێژایی مێژوی بەعس زۆر دەگمەن ژن توانیویەتی بگاتە پۆستێکی بەرز لەو حیزبەدا، بەعس بەهەمان چاوی کۆمەڵگەی عەرەبی لە ژنی روانیوەو زیاتر وەك بەختەوەریی و دیاریەك بۆ پیاو تەماشای کردوە. ئەمە ئەگەرچی لە پەیڕەوو پرۆگرامو گوتاریدا رەنگی نەداتەوە. بەڵام لە چۆنێتی مامەڵەکردندا رەنگی داوەتەوە.نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە ژن لەبەردەمی بەعسدا لە بواری خوێندنا بەپێی پێشکەوتنی سەردەم کە زیاتر بواریان بۆ رەخسا. بەڵام ئەمەش پەیوەندی بەوەوە نەبوو کە بەعس لەگەڵ ئەو پرۆژەیەدایە تا ئەوەی پەیوەندی بەو گۆڕانکاریە خێرایانەوە بوو کە لەبواری ئازادی ژندا رویاندا بوو کە لەدنیادا، ئازادی ژن لە دیدگایی بەعسەوە لەچوارچێوەی "اتحاد نساو" کەی عێراق تێنەدەپەڕی کە زیاتر "یەکێتی بەعساندنی ژنانی عێراقی" بوو نەك یەکێتی ژنان کە کار بۆ ئازادی ژن و بەشداری ژنان بکات لەواری گۆڕانکاری کۆمەڵگەدا، ژنان و کچانی نەیار بەدەسەڵاتی بەعس هەمیشە لەبەردەم هەڕەشەو سڕینەوەو سوکایەتی پێکردنابون، لەم بارەیەوە زیندانەکانی عێراق شایەدیەکی گەورە لەسەر ئەو پرسە ئەدەن، لە قۆناغی ئەنفالی کوردستانیشدا ئەو زەبرو زەنگە بەرابەر بەژنانی کوردستان گەیشتە چڵەپۆپەو لەدەرەوەی هەموو چوارچێوەیەکی بنەماکانی مافی مروڤو یاسا نێودەوڵەتیەکانداو ژنانی کورد بوون بە گەورەترین قوربانی ئەو کارەساتە، دیارە بەعس لەبەرابەر کۆی ژنانی نەیار بە بیروباوەڕەکەیدا ئەوەی کردوە. بۆیە لەم بارەیەوە دەکرێ زۆرترین بیرەوەری دەکۆمێنت بکەین، هەندێ جار

بەعس بۆ چەوسانەوەو زەبروزەنگ بەرابەر بە ژنان تەمەنی یاسایشی لەبەرچاو نەگرتووە، بیرەوەریەکانی مهابادو قەرەداخی، "سالێك لە دۆزەخ " یان بیرەوەری ئەو کچە بچوکانەی کە لەکارەساتی ئەنفالدا لە نوگرە سەلمان‌و تۆپزاوەو دووبز زیندانی بون نمونەیەکی بچوکە لەزەبروزەنگی بەعس هیچ کەس لەوانە تەمەنی "18" سالْیان تێ نەپەڕاندووە کە بەعس خستونیە ژێر زەبروزەنگەوە، لەیاسای باری کەسێتی عێراقیشدا کە بەعس کاری پێدەکرد ژن هەمیشە بێ بەش‌و ماف خوراو بووەو کەمتر لەپیاو تەماشای کراوە، ئەمە ئەگەرچی بە بەراورد لەگەڵ ولاّتانی دەوروبەری عێراق بەتایبەت ولاّتە عەرەبیەکان سعودیەو کوەیت، عێراق زۆر باشتر بوو، بەدرێژایی سێ‌و پێنج سالْی بەعس ژن لە عێراقدا سەرەڕای ئەوەی هەمیشە پلە خوارتر بوە لەپیاو، بەردەوامیش بەعس لەزۆر بواردا بۆ مەبەست‌و مەرامی سیاسی‌و کاری دیکە بەکاری بردوە.

مێژوی ئەو سی‌و پێنج سالە پڕە لە سوکایەتی کردن بە ژنان بەتایبەت کچانی زانکۆو هونەرمەندو شارەزایان. درۆ نابێ گەر بلێین دەسەلاّتی عێراق پڕ بوو لە راسپۆتین‌و لەسەرو هەمووشیانەوە سەدام‌و کوڕەکانی دڕەندەترینیان بون، ئێمە کە لەسەرەتادا گوتمان بەعس نەیتوانیوە لەو بوارەدا خۆی لە ئاوەزی عەرەبی رزگار بکات، مەبەستمان ئەو تێگەیشتنە بووە بەرامبەر بەژن کە لەئاوەزی عەرەبیدا وەکو کالاّی لەزەت‌و چێژ بەخشین تەماشا دەکرێ.

## کەرکوك‌و سەرکوتگەرایی

هەڵبەت هەڵبژاردنی کەرکوك بۆ ئەم بابەتەو قسە لەسەرکردنی، هەر ئەوە نەبووە کە سەنتەری پەنا بۆ داکۆکی کردن لەژنان ناوەندەکەی لەم شارەدایە تا ئەوەی مەبەست لە هەڵبژاردنی کەرکوك پەیوەندی بە چەندین خاڵەوە هەیە لەوانە:

1- پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە کەرکوك.

2- پێکهاتەی نەتەوەیی‌و ئاینی لە کەرکوك.

3- پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لەم شارەداو هەرەشەکانی سەری.

4- کەرکوك لەسایەی دەسەڵاتی بەعسدا.

5- کەرکوك‌و پرسی تەعریب‌و راگواستن.

6- مەسەلەی مافی مرۆڤ‌و مافی ژن لە کەرکوك.

کەرکوك یەکێکە لەو شارانەی عێراق کە هەر لەسەرتای دروست بونی عێراقەوە لە ساڵی 1921 پڕ کێشەترین شار بووە، ئێمە بەر لەوەی قسە لەوە بکەین دەبێ دان بەو راستیەدا بنەین کە لەسەردەمی عوسمانیدا کە عێراق لەدوو قۆناغدا جارێك سێ ویلایەت "موسڵ، بەغدا، بەسرا" جارێك چوار ویلایەت بووە" شارەزور، بەغدا، بەسرە، موسڵ؟ لەهەر دوو قۆناغدا کەرکوك شارێکی گرنگ‌و جێ بایەخ بووە لای عوسمانیەکان، لە راستیشدا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی شارەکەیش لەگەڵ شارەکانی دیکە جیاوازی هەبووە بۆ نمونە لەکەرکوکدا کوردو تورکمان‌و عەرەب‌و سریانی‌و جولەکەو ئەرمەنی‌و سابئەو خەڵکانی دیکە هەبووە کە ئەمە ئەگەرچی لە بەغداو موسل‌و شوێنی دیکەش هەبوە بەڵام بەم جۆرەی کەرکوك نا. کەواتە لە ڕووی خاوەنداریەوە هەمیشە بەر لە دروست بونی عێراق بەم فۆڕمەی ئێستاشیەوە جۆرێك لەکێشە لە

کەرکودا بونی هەبووە بەڵام کێشە بەمانا توندو تیژەکەی نا هەرچەند قاموسی ئەعلامی تورکی لە باسی کەرکوکدا دەڵێت سێ لەچوار واتە لە 30 هەزار نزیکەی 23 هەزار کوردن، بەڵام ئەوانی دیکەش بەپێی هاوڵاتی بونو ژیان تێیدا مافی خاوەنداریێتیان بە خۆیان داوە، پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەنێوان نەتەوەکانی کەرکوکدا هەمیشە بە هەڵچونو داچوندا تێپەڕیوەو لەو باوەڕەشەوە وڵاتانی دراوسێو حیزبە سیاسیەکان رۆڵی گەورەیان گێڕاوە، ئەمە بە پێچەوانەی بازاڕەوە کە پەیوەندییەکە توندو تۆڵەو ژنو ژنخوازیشی تێکەوتوە. دەسەڵات لە هەردوو قۆناغی پاشایەتی 1921 بۆ 1958 و کۆماری 1958-2003 تا روخاندنی بەعس رۆڵێکی زۆر خەراپی لە تێکدانی پەیوەندی نێوان نەتەوەکانی کەرکوکدا گێڕاوە، دەسەڵات بەو پێیەی بۆ هەمیشە بەدەست کەمینەی سونەی عەرەبیەوە بووە بەردەوام ئەوانی دیکەی گیرۆدەی ملکەچیو گوێ رایەڵی کردوە رەنگە سەرەتاکانی سەرکوتگەرایی لە کەرکوك بگەڕێتەوە بۆ هەنگاوەکانی دەسەڵات. ئێمە ئەگەر یەك یەك لەسەر ئەو خاڵانەی سەرەوە بوەستین کە ئاماژەمان پێکردون. تێدەگەین کە دەسەڵاتی سونەی عەرەبی بەتایبەتی لە کەرکوکدا کاری بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان تاکەکانی ئەم شارە کردووە، زاڵکردنی گیانی شۆڤێنێتی نەتەوەییو پرسی عەرەبی بونو کوردی بونو تورکمانی بونو شەڕکردن لەسەر رەسەنایەتیو ناڕەسەنایەتی سەرەتاکانی تێکدانی پەیوەندی نێوان ئەو تاکانەن کە شاری کەرکوك لە خۆیدا کۆیانی کۆدووەتەوە، مێژوی پێکەوە ژیانی نەتەوەکان لە کەرکوکدا بۆ سەدان ساڵ دەگەڕێتەوە. ئەگەرچی دۆخی نێو شارەکە لەگەڵ گوندەکانو ناوچەکانی دەوروبەر جیاواز بووەو زیاتر لەناو شاردا زمانی تورکمانی زمانی ئاخاوتن بووە بە حوکمی دەسەڵاتی عوسمانیو بونی ئەو زمانە

بە زمانی بازرگانی، بەلام لەناوچەکانی دەوروبەری کەرکوکدا بەگشتی خەلك بە کوردی قسەیان کردووەو زۆر کەم لە هەندێ شارۆچکە نەتەوەکانی دیکە هەبونە. وەك وتمان لە دەرەوەی هەنگاوەکانی دەسەلاتا سەرەڕای ئەوەی کە کۆمەلی کەرکوك‌و بارودۆخی شاری کەرکوك هێشتا لە قۆناغی فیودالی تێنەپەڕیوەو کەرکوك سەرەڕای ئەوەی لە رابردوودا ناوەندێکی بازرگانی گرنگی نێوان بەغداو موسل‌و هەولێرو سلێمانی‌و کۆیەو سنەو شوێنەکانی دیکەش بووە، سەرەڕای بونی نەوتی زۆر لە خاکەکەیدا بەلام پێکهاتە کۆمەلایەتیەکەی نەیتوانیوە قۆناغی فیودالی تێپەڕێنێ‌و بیرکردنەوەو بڕیارو داب‌و نەریت‌و مامەلە بەشێکی زۆری تا ئەم چرکە ساتەش فیودالانەیە. هەرچەند لەنێوان پێکهاتە جیاوازەکاندا وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا ژن‌و ژنخوازیش هەبووەو تەنانەت لەو رووەوە کچانی شاری‌و لە خێزانی جیاوازتریش لە روی کۆمەلایەتیەوە، شویان بە خەلکی دەشت کردووە، بەلام ئەمەش ناکاتە ئەوەی کە ئێمە دان بەو راستیەدا بنەین کە لە کۆمەلگەی کەرکوکدا دەرەبەگ‌و ئاغا رۆلی گەورەیان گێڕاوە لە دابەشکردنی کۆمەلگادا بۆ چەندین گروپی جیا جیاوە، کە زۆربەی کات ئەم گروپە جیاواز جیاوازانە بە یەکەوە ناگونجێن‌و لەروی خوێندنەوەی یەکدی‌و لە یەکڕوانینەوە بەچاوی سوك‌و کەم بایەخ تەماشای یەکدی دەکەن، ئێمە لەو بڕوایەداین ئەمەش یەکێکە لە سیما نێگەتیفەکانی کۆمەلگەی رۆژهەلاتی‌و هەر بەتەنێ کەرکوکیش وا نییەو ئەو دۆخە لەزۆربەی شارو ناوچەو ولاتەکانی رۆژهەلاتدا هەیە، دیارە تایبەتمەندی کەرکوکیش لەڕوی جیاوازیە نەتەوەیی‌و ئاینیەکەشەوە ئەوەش کاریگەری هەبووە، نەتەوەو پێکهاتە ئاینیەکانی کەرکوك ئەگەر لەروکەشدا بەرێزەوە لەیەکیشیان روانیبیێت بەلام لەناو خۆیاندا

تێبینی‌و سەرنجی دیکەیان هەبووە لەسەر یەکتر کەلتوری نەتەوەو ئاینە جیاوازەکان لە کەرکوك پڕە لە پەندو نوکتەی سەیرو سەمەرە کە لەسەر یەکتر گوتویانە، هەندێك لەو نوکتەو چیرۆکانە ئەوەندە ناشرینن کە مرۆڤ بێز لە گێڕانەوەشیان دەکاتەوە، ئەمە بێ جیاوازی هەموو لەسەر یەکدی ئەو شتانە دەڵێن‌و لەروکەشیشدا دەیشارنەوە، بە نمونە ئاماژە بە چەند نوکتە لەوانە دەدەین کە بۆ کەم بایەخ کردنی یەکتر گوتراون، عەرەب لە ساڵی 1963 لەپەنای حیزبی بەعسەوە پەلاماری کوردستانیان داو زۆربەی گوندەکانی دەوروبەری داو کەرکوکیان تالآن کردو سوتاند، ئەوان لەو هەڵمەتانەدا دەیانگوت

احن العرب اهل الغیرەنگرد الآكراد من ها الديرە

یان کورد لەسەر عەرەب شتێکیان هەبوو دەیانگوت

عەرەب زوڕات .................................

عەبا هەلگرە بڕۆ بۆ شکات

تورکمان لەسەر کورد پەندێکیان هەیە دەڵێ

نەدار دەبێت بەمەقاش

نەکورد دەبێ بە پاشا

هەڵبەت ئەمانە نمونەی زۆر بچوکن‌و ئەدەبیاتی میللی ئەو نەتەوانە پڕە لە نوکتەو هۆسەی لەم جۆرە، لەپشت هەموو ئەم سوکایەتی پێکردنانەوە دەسەلآت رۆڵێکی گەورە دەگێڕێت، هەر ئەمەشە دواجار پێکەوەژیان لە کەرکوکدا دەخاتە مەترسیەوەو پەیوەندیەکان بەرەو هەڵوەشانەوە دەبات، ئێمە قسە لە پێکەوە ژیان دەکەین، دەبێ ئەو راستییە لەبەرچاوبگرین کە پێکەوەژیان لە کەرکوك پێکەوەژیانێکی

چارەنووس سازو هەمیشەییەو شەڕکردن لەگەڵی جگە لە گێلی هیچی دیکە نییە، ماوەی "35" ساڵی دەسەڵاتی بەعسیش ئەو حەقیقەتەی زیاتر رونکردەوە کە هەرگیز زەبرو زەنگ ناتوانێ لەسەر حسابی لایەك لایەکی دیکە زاڵبکاتو کەس ناتوانێ ئەوی دیکە بسڕێتەوە، دەشێ ئێمە دواتر زیاتر لەسەر ئەوە قسە بکەین، قسەی ئێمە ئەوەیە تۆ ناتوانی بە هەڵوەشانەوەی پێکەوە ژیان کەس لەم شارەدا بسڕیتەوە، کەواتە دەبێ بەدوای خاڵە هاوبەشەکانی پێکەوەژیاندا بگەڕێی‌و کار بۆ ئەوە بکەیت کە هەڕەشەکانی سەر پێکەوە ژیان لە "خودپەسەندی، سڕینەوەی ئەوی دی، زمانی لێبوردەیی، خۆ بە هەموو شت زانین" نەهێڵێت، دیارە بنچینەکانی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە بریتین لە "رێزگرتن لە یەکدی، لێبوردەیی، یەك قەبولکردن" کە ئەمە بەجۆرێ لە جۆرەکان لە کەرکوك تائێستا کاری دەوێت‌و پێوستە گروپەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی‌و رێکخراوە ناحکومییەکان‌و رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ قورسایی زیاتر بخەنە سەر ئەو لایەنەو سیاسەت‌و پەیڕەوو پرۆگرام‌و میدیای حیزبەکان بخەنە ژێر پرسیارەوە کە هەندێ جار مامەڵەو هەڵس‌و کەوت‌و رۆڵێکی خراپ لە هەڵوەشانەوەی پێکەوە ژیاندا دەگێڕن. کەرکوك لە 35 ساڵی دەسەڵاتی بەعسدا نەك هەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتی‌و نەتەوایەتیەکەی بەرەو هەڵوەشانەوە چوو ، بگرە گیانی خاوەنداریێتی‌و سڕینەوەی ئەوی دیکە بەڕادەیەك قوڵکرایەوە کە ئیدی بواری ژیان بەهیچ جۆرێك بۆ ئەوانی دیکە نەما، ئێمە پێشتر لەبارەی حیبزبی بەعس‌و بیروبۆچون‌و مامەڵەی ئەو حیزبەوە لەگەڵ ئەوانی دیکە قسەمان زۆر کردووە بۆیە ناکرێ لێرەدا بگەڕێینەوە سەری. بەعس لە 35 ساڵی دەسەڵاتی خۆیدا لە کەرکوك نەك هەر کاری لەسەر لەشارخستنی ئەو شارە دێرینە کرد بگرە جوگرافیای ئەو شارەی بە

تەواوەتی هەڵوەشاندەوەو نزیکەی 51٪ی خاك‌و خەڵكی ئەو شارەی لە کەرکوك دابڕی‌و خستیە سەر شارەکانی دیکەی وەك سلێمانی‌و هەولێرو تکریت‌و دیالە، دابڕینی شارەکانی چەمچەماڵ، کەلار، کفری، خورماتو بەکۆی ناحیێکانیانەوە، جگە لەوەی لەڕوی روبەرەوە پتر لە نیوەی ئەو شارەی دابڕی، لە روی پێکهاتەی نەتەوایەتیشەوە رێژەی پێکهاتە نەتەوایەتیە ئاساییەکانی هەڵوەشاندەوە، ئەمە هەڵبەت لە قۆناغی ئەنفالدا گەیشتە چڵە پۆپەو پتر لە (700) گوندی کوردەکان لە پارێزگای کەرکوك لەگەڵ زەویدا تەخت کران‌و زۆربەی هاوڵاتیەکانیان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن (هەردوو کتێبی جینۆساید لە عێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کوردو کوردو کەرکوك بخوێنەرەوە) بەعس لە کەرکوکدا پەیوەندییە ئاکارییەکانی نێوان پێکهاتە جیاوازەکانی هەڵوەشاندەوەو پەیوەندی ئاسایی نێوان هاوڵاتیانی شارەکەی گوازتەوە بۆ رق‌و کینەو یەکبوغزاندن‌و سڕینەوەی یەکدی، بەعس لە رێی شۆڤارو جاسوس‌و موختارو بەرپرسی حیزبی‌و پیاوەکانی خۆیەوە تەنانەت لەنێو خێزانەکانیشدا پەیوەندی‌و پێکەوەیی هەڵوەشاندەوەو گیانی خۆشەویستی‌و هاوکاری‌و بەتەنگەوەهاتنی یەکدی لەرەگ‌و ریشە دەرکێشا، هێنانی بەلێشاوی عەرەبی تەعریب لە شارەکانی خواروی عێراقەوە بۆ کەرکوك‌و نیشتەجێ کردن‌و دامەزراندنیان، رقێکی گەورەی لەناخی خەڵکە رەسەنەکەدا دروست کرد، هەڵبەت ئەوانەی کە هێنرابون ئەوانیش هەمان رقیان بەرابەر خەڵکە رەسەنەکە هەبوو دەسەلاتیش بەهەموو تواناوە هاوکاری دەکردن، بەخشینی پارەی زۆر، خانوبەرەو زەوی‌و کار هۆکاری گرنگ بون بۆ تێکدانی پێکهاتەی دیمۆگۆافی شارەکە، حیزبی بەعس هەر بەهێنانی عەرەبی هاوردە لێنەگەڕاو هەر بەوە رازی نەبوو کە لەمەودوای 31 ساڵی 1972 بۆ

2003 زیاتر لە "30" گەڕەك‌و كۆمەڵگەی بۆ عەرەبی تەعریب لەناو شاری كەركوك‌و دەوروبەری دروست كرد، بگرە هەستان بەراگواستن‌و دەركردنی كوردو توركمان‌و خەڵكانی دیكەو لەمەودای ئەو 31 ساڵەدا پتر لە چارەكە ملیۆنێك كوردی لە كەركوك‌و دەوروبەری دەركردو راگواست، ئەمە جگە لەوەی دواجار بڕیاری گۆڕینی مۆركی نەتەوەیی داو زەمینەی رەخساند كە كوردو توركمان خۆیان بكەن بە عەرەب‌و لەنێو بڕیارەكانیدا بڕیاری ئەوەشی دا كە ئیدی جگە لە ناوی عەرەبی رێگە نادرێ بە هیچ ناوێكی دیكە منداڵ ناوبنرێ‌و هەموو ناوێكی غەیرە عەرەبیش بۆ نمونە ناوی توركمانی‌و كوردی بەناوی بیانی ناوزەد دەكرا. هەموو ئەم هەنگاوانەو جۆرەها هەنگاوی دیكە سیمای ئەو شارەی بەتەواوەتی شێواند، ئێمە كە لەم روانگەیەوە دەڕوانینە مافی مرۆڤ لە كەركوك تێدەگەین كە شتێك نییە ناوی مافی مرۆڤ بێت‌و بەكردەوە لە كەركوكدا پرۆسەی سڕینەوەو جینۆساید هەبووە ئیدی لە دۆخێكی وادا قسەكردن لە مەسەلەی مافی مرۆڤ‌و پێكەوەژیان‌و دیموكراسیەت‌و لێبوردەیی جگە لەسوكایەتی كردن بەو چەمكانە هیچی دیكە نییە، مرۆڤ بون لە دۆخێكی وادا لای بەعس پەیوەندی بەوەوە هەیە تا چەند تۆ بەعسیەكی دڵسۆز، عەرەبێكی بەعسیت، ئیدی مەسەلەی جیاوازی كورد بون، توركمان بون، سریانی بون، ئەوانە هەموو دەبێ بخرێنە خزمەتی عەرەبی بون‌و بەعسی بونەوە، هەڵبەت كە مرۆڤ بەگشتی لەم چوارچێوەیەدا ئاوا بژێت ژن دۆخەكەی خراپترەو شتێك نیە ناوی مافی ژن بێت، ئێمە پێشتر لەسەر ئەو مەسەلەیە وەستاوین، كەركوك یەكێكە لەو شارانەی كە مێژویەكی پڕ لە سوكایەتی كردن‌و سەركوتگەرایی تێپەڕاندوەو هەمیشە لەبەردەم شەڕی نەتەوەیی‌و تائیفیدا بووەو بەردەوام دەسەڵاتە یەك لەدوای یەكەكان كاریان لەسەر

تێكدانی پەیوەندییەكان كردووە.ڕووداوی ساڵی "1959" كە بەشەڕی كوردو توركمان ناسراوە لە مێژوداو چەند ساڵێك درێژەی كێشاو تا ئەم چركە ساتەش برینەكانی ساڕێژ نەبونەو بەشێك لە نەتەوەپەرستە شۆڤێنیەكان كار لەسەر قوڵكردنەوەو هەڵدانەوەی دەكەن لەم بارەیەوە "كتێبو فیلمی دەكۆمێنتی" هەیە كە بەردەوام ئەو برینانە هەڵدەدەنەوە، بێئەوەی بەژیرانە مامەڵە لەگەڵ ئەو رابردووەدا بكرێ‌و كار بۆ سڕینەوەو ساڕێژكردنی بكرێ، جگە لەو روداوە پێشترو دواتریش چەندین جار كار بۆ ئەوە كراوە كە پەیوەندی نەتەوەكانی كەركوك بە ئاكارێكی خوێناویدا ببرێ، لەم بارەیەوە جگە لە گیروگرفتەكانی ناوخۆو هەنگاوەكانی دەسەلات زۆر جار وڵاتانی دەرەوەش رۆڵیان بووە، بۆ نمونە روداوی 1959 ی كەركوك لە میدیای توركیاو ئێران‌و وڵاتە عەرەبیەكاندا زۆر گەورە كراوەتەوەو لەو رۆژگارەدا كار بەو ئاراستەیە كراوە لەرێی میدیاوە كە كێشەكە بەرەو خەتەرناك تر ببرێ هەوڵدان بۆ ئەوەی كەركوك لەو دۆخەوە بگوێزرێتەوە بۆ دۆخێكی باش‌و ئارام پێویستی بە پشو درێژی‌و بەرنامە رێژی ورد هەیە. بەرنامە رێژی لەهەموو رویەكەوە بۆ نمونە زاڵكردنی گیانی هاوڵاتی بون بەسەر گیانی نەتەوەییدا بەشێوە توندڕەویەكەی، گۆڕینی سیستمی پەروەردەو چاككردنی بەو جۆرە كە ببێتە هۆیەك بۆ پەرەپێدانی رێزو خۆشەویستی‌و یەك قەبوڵكردن‌و لێبوردەیی، كاركردن بۆ سڕینەوەی سیماكانی ئەو رابردووە تاریكە بەگۆڕینی ئاوەزی تاكەكانی ئەم شارە بە ئاراستەی یەك خوێندنەوەو رێزگرتنی لە ئازادییەكانی یەكتر، گێڕانەوەی بارودۆخی جیۆگرافی‌و كۆمەڵایەتی كەركوك بۆ دۆخی ئاسایی خۆی‌و ئاشتكردنەوەی نەتەوەكان‌و پێكهاتە جیاوازەكانی نێو كەركوك، سەرخستنی ئەم پرۆژانە پێویستی هەم بەكادیری شارەزاو

پسپۆڕ لە مافی مرۆڤو لێبوردەییو دیموکراسی هەیە هەم بودجەی تایبەت، ئەمە جگە لەوەی کە میدیای ئازادو ناوەندی رۆشنبیری نەتەوەکان دەتوانن لەو بارەیەوە رۆڵێکی گەورە ببینن.

## ژن و بەشداری کۆمەڵایەتی

لەسەرجەم ئەو بابەتانەدا کە لەم کتێبەدا قسەیان لێکراوە باس لەوە کراوە کە ژن لەم کۆمەڵگایانەدا لە چ بارودۆخێکدا دەژی، پێشتریش باس لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتی کراوە، کە چۆن ئینسانەکان بە پلەو پۆستی کۆمەڵایەتی بەسەر چەندین سەرەناودا دابەش بونە، وەك شێخ و سەیدو مەلاو ئاغاو هتد، هەڵبەت ژنانی ئەو گروپانە هەمیشە دەستو پێ سپی ترن لەوانی دیکە، ئەگەرچی ئێستا بواری خوێندن و بەشداری تاڕادەیەك هێندێك لە جیاوازییەکانی کاڵکردووەتەوە، بەڵام جیاوازی توانای ئابوری و بونی چینی جیاواز لە روی داهات و بەیەکچاو نەڕوانینە تاکەکانی کۆمەڵگەو کاریگەری رابردو پایەو پلە لە ئاوەزی تاکەکانی کۆمەڵگەی فیودالی وایکردووە، هێشتا زەبروزەنگی سەر ژنان کاریگەری زۆری هەیە، بۆ نمونە ئەو دابەشکردنە کۆمەڵایەتییە وایکردووە کە چ بەهۆکاری دانەبەزینی پلەو پایە لەلایەك و چ بەهۆی لەدەست نەدانی سەروەت و سامانی ئەو گروپانەی کە لەسەرەوە ناومان بردون هەرگیز ئامادە نەبن کچی خۆیان بدەن بە گروپی بەرابەر ئەوە لە کۆمەڵگەی فیودالیدا دابەش دەبێ بەسەر ئاغاو مسکێن، یان شێخ و رەعیەتدا. بۆیە دەبینین زۆرجار کچانی ئەو گروپانەی سەرەوە تەمەنیان تێدەپەڕێ و لە بەرابەردا براو باوکەکانیان ئەو مافە بەخۆیان دەدەن هەریەکەیان لە یەك ژن تا چوار ژن بهێنن، لەساڵانی رابردوودا سەرەڕای خوێنەواری و بونی بڕوانامەی بەرز لەناو کچاندا چەندین کچ بە بڕوانامەی بەرزەوە بونە ژنی دووەم و سێیەم و چوارەم، ئەمە لە کوردستانی عێراق و لە عێراقی عەرەبیشدا هەروایە دیارترین دوو نمونە کە قسەی زۆریان لەسەر کرا شووکردنی نەسرین

بەرواری بوو بە غازی عەجیل یاوەری جێگری سەرۆك کۆمارو سەرۆکی کاتی‌و شوکردنی مامۆستایەکی ناوەندی بو بە وەزیری پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەمانە نمونەی زۆر کەمن لەچاو ئەو بارودۆخەوە کە ژن لەم کۆمەلگایەدا تیایدا دەژێت.

لە رابردوودا ژن زۆر کەم لە بواری کۆمەلایەتیدا توانیویەتی بەشداری بکات. رەنگە بونی ناوی چەند ژنێك لێرەو لەوێ نیشانەی ئەوە بێت کە ئەو ژنانە جۆرێك لە یاخی بونیان راگەیاندووەو کۆت‌و پێو ەندی کۆمەلگەیان پساندوە، هەر ژنێك لەم کۆمەلگەیەدا جۆرێك لە ئازادی بۆ خۆی فەراهەم کردبێت بۆ سوکایەتی پێکردن پێیان گوتووە "کوڕانی" هەر وەك چۆن بەپێچەوانەشەوە بەوانی دیکە وتراوە "کچانی" بە درێژایی دەیان ساڵ‌و تا ئەم چرکە ساتەش لەسەدان خێزانی عێراقیدا جا لە کەرکوك یان بەسرە یاخود سلێمانی بۆ ژنان نیە بەشداری کۆڕو کۆبون‌و دیوەخانی پیاوان بکەن، ناوی دیوەخان ناوێکی قۆناغی فیوداڵیەو بەو ژورە گەورەو پۆشتەیە دەگوترێت کە تەنیا پیاوانی گەورەو ناسراو لێی دادەنیشن‌و بۆ ژن نیە لێی بچێتە ژورەوە. ئەمە جگە لەوەی لە بواری کۆمەلایەتیدا ژنان نەك هەر ئەو بەشداریەیان بۆ نییەو بڤەیە توخنی بکەون، هەر چۆن پێشتر لەبابەتی ژن لەنێو کەلتوردا باسمان کرد، تەنانەت بۆ ژنان نیەو تائێستاش هەروایە لەزۆر مەسەلەو پرسی گرنگدا بەشداری بکەن، بۆ نمونە ژنان ناتوانن لە مەراسیم‌و بۆنەی ئایینیدا رێبەرایەتی‌و وتار خوێنی‌و پێش نوێژی بکەن، ناتوانن لە ئاشتەوایی میلیدا کەتائێستا دواکەوتوترین سیمای قۆناغی فیوداڵیەو رێگا نادات قانون ئاراستەی خۆی وەربگرێ، بەشداری بکەن، "ئاشتەوایی میللی" یان ناوە باوەکەی "سوڵحی عەشایەری" یەکێکە لەو دیاردە ناشرینانەی لە کۆمەلگای عێراقیدا

بەتۆخی بونی هەیەو زۆرجار دەسەڵاتو حکومەتو پیاوانی قانونیش بەشداری تیا دەکەنو رۆڵی تیا دەگێرن. لەسیستمی فیودالێدا هێندەی قسەی ئاغایەك جیٚبایەخو گرنگە هێندە بەندەکانی قانون گوێیان لیٚ ناگیریٚ!!

ژن لەم کۆمەڵگە داخراوانەدا جگە لە کاڵا هیچی دیکە نیە، ئیدی بەشداریە کۆمەڵایەتیەکەشی لە کاڵابون تێناپەریٚ، بۆ نمونە لەو ئاشتەواییە میللەدا زۆر جار بۆ رێکەوتنەوەو نەهێشتنی رقو قینو پێکهاتنەوە دەکرێتە قوربانیو دەبەخشریٚ، ئەم دیاردەیە تائێستا بونی هەیە، سیماو رەنگەکانی کۆمەڵگەی داخراو دەیانو سەدان سوکایەتی سەیر سەیری بەژنان تیایە کە مرۆڤ لە بەرابەریاندا تەریق دەبێتەوە، دیاردەکانی فرەژنی، "مارەبەجاش"*، تالوق کردنو بەستنەوە، نمونەی ئەو سوکایەتی کردنانەن کە ئەمە خودی ژنیشی گەیاندوەتە ئەو باوەرەی کە ئەو لە "زەعیفە" یەك زیاتر نیە زەعیفە وشەیەکی عەرەبیە لێرەدا بەواتا بێدەسەڵاتو هیچ لەبارانەبوو دێت.. دیارە کە کەسێك هەر لەسەرەتاوە بریاری ئەوە لەبارەی خۆیەوە بدات کە "زەعیفە" ئیتر ناتوانریٚ لەبواری کۆمەڵایەتیدا بەشداریەکانی ئەژمار بکریٚ، "زەعیفە" ناتوانیٚ دوکانداری بکات، ناتوانیٚ بەتەنیا سەفەر بکات، ناتوانیٚ بریار بدات، ناتوانیٚ خۆشەویستی بکات بەئاشکراو بیٚ ترس. لەبەر ئەوەی هەموو خۆشەویستییەکی ئاشکرا لەکۆمەڵی ئێمەدا ئەنجامەکەی دیارە!!

---

* مارە بە جاش: کردەیەکی زۆر ناشیرینی کۆمەڵگەیەو لەو حاڵەتەی کە پیاوێك لە ژنەکەی جیا دەبێتەوە دواتر بۆ گێرانەوەی دەبیٚ ژنەکەی شەوێك لای کەسێکی دیکە بخەوێت، ئەمە ئەگەرچی لە بنەرەتدا قوربانی ژنەکەیە بەڵاك بەپێی بیروباوەرە ئاینیو کۆمەڵایەتیەکە تۆڵەکردنەوەیە لە پیاوەکە!!

زەعیفە بونەوەرێکە ئەگەر پیاوێك دەستی نەگرێ، رینمایی نەکات ناتوانێ رێگاکان بدۆزێتەوە، هەموو ئەمانە سەرچاوەکەیان ئەو کەلتورەیە کە پێشتر قسەمان لەسەری کردووە. تۆ قسە لە بەشداری کۆمەڵایەتی دەکەیت، قسە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی، لە گوازتنەوەی کۆمەڵگا لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە دەکەیت، قسە لە دەربڕینی ئازادانەی بیرورِا دەکەیت، کە ئەمانە هیچیان بونیان نیە، لە رۆژهەڵات بەگشتی‌و لە عێراق بەتایبەتی مێژو پیاو نەخشەی بۆ دەکێشێ پیاو دەینوسێتەوە، ئاینده پیاو دیاری دەکات، بڕیار لای پیاوە، کۆمەڵگە کۆمەڵگەیەکی پیاوسالاری هێندە ترسناکە کە تەنانەت شانازیە کوڕ لەو کۆمەڵگایەدا هەموو نەشیاوێك بکات‌و کچ کفرە. خۆ دزینەوەی ژنان لە بەرپرسیارەتی گرنگ بەشێکی زۆری پەیوەندی بەو رابردووەوە هەیە کە ئەوانی وەکو کۆیلە وێناکردووە، کۆیلە ناتوانێ هیچ سنورێك ببەزێنێ‌و ناتوانێ لە خاوەنەکەی یاخی بێت. رابردو بەردەوامی لەئێستادا بۆ سەرکوت کردنی ژنان ئامادەیی هەیەو زۆرجار تەنانەت ئەو ژنانەش کە لەبواری کۆمەڵایەتیدا دێنە پێشەوە هەر زوو پاشەکشە دەکەن یان دەیان قسەوقسەڵۆك‌و نوکتەو سوکایەتی دوایان دەخرێت.

زۆربەی ئەو ژنانەی لە رۆژهەڵات‌و بەتایبەت لە عێراق‌و کوردستان لە بواری هونەری سینەما، شانۆ، نواندن، بواری دیکەدا کار دەکەن وەك میدیا، نوسین هتد. لەلایەن کۆمەڵگەوە بەر نەفرەتێکی نهێنی دەکەون‌و بەشێکی زۆریان بەنەڕەخسانی هاوسەرگیری‌و پەراوێز خستن لەلایەن کۆمەڵگەوە تۆڵەیان لێ دەکرێتەوە.

لەم نێوەندەدا دۆخی کەرکوك ترسناك ترین دۆخێکە بەتایبەت گەر بزانین هەمیشە سڵ کردنەوە لەیەکتر یەکێ لەمۆرکەکانی کۆمەڵگەی کەرکوکە، سڵ کردنەوە لەیەکترو گومان لەیەکدی کردن بەئاشکرا درکی

پێدەکرێت. بۆ نمونە لەخۆپارێزی کچانی نەتەوەو ئاین‌و مەزهەبە جیاوازەکانی لەیەکدی، خۆ دوورەپەرێزگرتن، بونی شەرمێکی کوشندە کە دواجار ئازایەتی‌و بڕیارو رووبەڕوونەوە لە مۆرڤدا دەکوژێ.

ئەگەر یەك نمونەی گرنگ لێرەدا بێنینەوە بواری شانۆیە لەشارێکی وەکو کەرکوکدا کە پتر لەملیۆنێك هاوڵاتی تیا نیشتەجێیە بەشارو شارۆچکەکانیەوە کەچی تائێستا چوار کچی شانۆکار نەیانتوانیوە لەو بوارەدا درێژە بەکارکردن بدەن، هەڵبەت شانۆ یەکێکە لەهۆکارەکانی گۆڕینی بیرو باوەڕی کۆمەڵگە، ئەمە لە بواری دیکەشدا هەر وایە، بەشداری کۆمەڵایەتی پەیوەندی بەوەوە نیە لە قوتابخانەی ئەلف 90٪ی مامۆستاکانی ژنن یان نەخۆشخانەی میم زۆرترین دکتۆرو یاریدەدەری پزیشکی ژنی تیایەو تا دوای، بەشداری کۆمەڵایەتی پەیوەندی بەکاریگەری ژنانەوە هەیە لە گۆڕینی کۆمەڵگەدا، لە بیروباوەڕی پیاوسالارانەی کۆمەڵگەدا، ئێمە دەبێ ئەو حەقیقەتە بزانین کە لەکۆمەڵگەی پیاوسالاریدا ژن بۆ خۆیشی بەشێکە لە درێژەپێدەری ئەو سیستمە، بیرکردنەوەکانی ژن، چۆنێتی هەڵسوکەوتی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئازادیەکانی خۆیدا، ئەمانە بەگشتی درێژەپێدەری سیستمەکەن، نمایشی جەستە، بەکاڵاکردنی جەستە لە رێگای پێشکەوتوترین تەکنەلۆژیای راگەیاندنەوە ئەوەندەی گێڕانەوەیە بۆ کۆیلەکردن، ئەوەندە هێنانە نێو کایەی بەشداری کردن نیە، گرفتی گەورەی ژنان یان بەشێك لە تێگەیشتنیان پەیوەندی بەم خاڵەوە هەیە، ئەوان، یان زۆرێك لەوان ئەوە بەبەشێکی گرنگ، لەئازادیەکە دەزانن، کە لە بنەڕەتدا ئەوە بیروڕای زۆر تایبەتی تاکەکانەو ناکرێ دەست وەربدرێتە نێو ئەو تایبەتمەندیانە، هەروەك لە بەرابەردا هێندێکیش پێیان وایە خۆپێچانەوەو باڵاپۆشی بەشێکی گرنگی ئازادیەکەیانە کە لەراستیدا

هەردوو ئەم تێگەیشتنە دورخستنەوەی ژنانە لەپرسی سەرەکی، پرسی بەشداری کردن، پرسی گۆڕان، ، پرسی بەرگری کردن لەئازادیەکانی بیروباوەڕو قسەکردن‌و بیرکردنەوەو دۆزینەوەی ریگاکە، ئێمە کە لەم روانگەیەوە تەماشای بەشداری کۆمەڵایەتی ژنان بکەین. دەگەینە ئەو راستیەی کە ژنان ئاستی بەشداری کۆمەڵایەتیان لە خوار سفرەوەیە، بەڵام لەگەڵ کۆی ئەم سەرنجانەدا زۆر جار لە مێژوودا لێرەو لەوێ هەڵکەوتووە ئافرەتانێك رۆڵێکی گرنگ بگێڕن لەسەردەمەکەی خۆیاندا مێژوی ئەم ناوچەیە چەندین ناوی درەوشاوەی تیایە بۆ نمونە ناوی وەك حەپسەخانی نەقیب، "نەعە نێر" ئەگەرچی ناوەکەشی لە سیستمی پیاوساریدا دیسان کەمکردنەوەیە لەژن بون، یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی کە لە شۆڕشەکەی برایم خانی دەلۆدا لە کفری رۆڵێکی بەرچاوی بووە، کوێخا نەرگزی ناوشوان یەکێکی دیکەیە لەو ژنانەی کە چەندین چالاکی کۆمەڵایەتی هەبووە، لەم نمونانە دەشێ لە پانتایی عێراقدا لێرەو لەوێ بەرچاو بکەون ئەگەرچی ئەوانە لە پەنجەکانی دەست تێناپەڕن.

## دیموکراسی و هەڵبژاردن

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین هەموو تاکێکی کۆمەڵگا پەیوەندییەکی هەیە بە بەهەندێك گروپ و ئەنجومەنی جۆراو جۆرەوە, ئەم گروپ و ئەنجومەنانە بۆ ئەنجامدانی کارێك، یان بۆ خۆبەڕێوە بردن، یان بۆ دەستەبەرکردنی ماف و ئامانجەکان پێویستیان بەبڕیاردانی بەکۆمەڵ و تاوتوێکردنی ئەو بڕیارو بیرکردنەوانە هەیە .

ئەم جۆرە بڕیاردانە بە بڕیار گەلی بەکۆمەڵ ناو دەبرێت ،دیموکراسی پەیوەندی بەجۆری بڕیاردانی بەکۆمەڵەوە هەیە .دیموکراسی لە چەمکی خۆیدا دەربڕی ئەو ئامانجەیە کە ئەو بڕیارانەی کاریگەری لەسەر کۆمەڵگەیەك دادەنێ، دەبێ بیرو رای تەواوی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە لە خۆبگرێت و هەروەها پێویستە تەواوی ئەندامەکانیشی لەمافی یەکسانیان هەبێت بۆ بەشداری کردن لەبڕیاردانـدا ، بەمانایەکی تر بوونی دیموکراسی پێویستی بە دوو پرنسیپی هەیە، واتە چاودێری گشتی بەسەر بڕیاردانی بەکۆمەڵ وهەبوونی مافی یەکسان لە بەکاربردنی ئەم چاودێرییەدا . چەند ئەم دوو پرەنسیپە لەپرۆسەی بڕیاردانی کۆمەڵگەیەدا زیاتر بێتەدی ئەو کۆمەڵگەیە (دیموکراتی)تر دەبێت .

کەواتە دیموکراسی بەر لە هەر شتێك بڕیاردانی بە کۆمەڵە و ئازادی و یەکسانی تاکەکانی کۆمەڵە بۆ بڕیادان لەسەر چارەنووس و بەڕێوەبردنی دەوڵەت وکۆمەڵگە بەشێوەیەکی یەکسان و تەندروست.

دیموکراسی گەلێك هەل دەڕەخسێنێت بۆ:

1- بەشداری راستەقینە.

2- بەکار هێنانی کۆنترۆڵی کۆتایی بەسەر دەستوری کاردا

3- بەدەستهێنانی تێگەیشتنێکی روون وئاشکرا.

4-دەنگی یەکسان.

5- تێکـەڵکردنی پیروبەساڵاچـوان وژنـان و پیـاوان بەیەکـسانی لـە بەردەم یاساو هەڵبژاردن وبڕیارداندا بە بێ جیاوازی.

گـــرنگترین ئـــەو بەهایانـــەی کـــە دیموکراســـی بۆهاوڵاتیـــان بەدەستدەهێنێت ئەمانەی خوارەوەیەن:

## یەکسانی مافەکانی هاووڵاتیبوون

ئامـــانجی دیمـــوکراتی کـــارێکی یەکـــسانە لـــە گـــەڵ تـــەواوی خەڵکیـدا.(چێرمی بنتـام)دەڵێت:دەبێت هەریـەك لەتاکـەکانی کۆمەڵگـە بەئەندازەی تاکێك لە قەڵەم بدەین ونابێت هیچ کـەس لـە تاکێـك زیـاتر بێتـە ئـەژمار !!,بـەپێی بنـەمای یەکسانی حکومـەت نـەك تـەنها دەبێـت بەشێوەیەکی یەکسان بایەخ بەبەرژەوەندییەکانی خـەڵکی بـدرێت,بـەڵکو دەبێت بەشێوەیەکی یەکسانیش بەها بۆ بیروڕاکانیان دابنرێت .

## بەدیهێنانی پێداویستییەکانی جەماوەر

لەبنەڕەتـدا حکومەتـە دیموکراتییـەکان زیـاتر لـەجۆرەکانی دیکـەی حکومـــەت توانـــای بـــەدیهێنانی پێداویـــستیەکانی خـــەڵکی ئاســـاییان هەیـــە.چـــەن خـــەڵکی ئـــارەزووی لەدارشـــتنی سیاســـەتەکاندا زیاتربێـت,ئەگـەری ڕەنگدانـەوەی خواسـتەکان وئامانجەکانیـشیان زیـاتر دەبێت.

خەڵكــە ئاســـایی‌یەكان كەبـــەكردەوە هەســـت بەدەرئـــەنجامی سیاســەتەكانی حكومــەت دەكــەن و، هەرچــەندە لــەخوارەوە هەنــدێك كارامەو هاوڕێـك بـۆ فـشار هێنـان و كـارتێكردن لـە ئارادابێت،دەوڵـەتیش دەرنجــامی واقیعـــی كارەكـــانی پێـــچەوانە دەكاتـــەوە. دەســـەڵاتدارانی دەوڵـەت،،ئەگـەر نیـاز پـاكیش بن،بـەڵام ئەگـەر لەدەسـەڵات و كـۆنترۆڵی خەڵكی دڵنیابن لەگەشنینانەترین دۆخـدا سیاسـەت گـەلێك دادەسـەپێنن كـــە لەگـــەڵ خواســـتەكانی خەڵكیـــدا ناگونجێـــت و،لـــە خـــراپترین دۆخیشدا،دووچاری گەندەڵی وخۆپەرستی دەبن.

ئــالێرەوە دەبێــت تێگەیــشتن لەدیموكراســی ببێتــە پێویــستییەكی هەنوكــەیی بــۆ دروســت كردنـــی روحـــی بەرپرســیارێتی ورەخنـــەو داكـۆكیكردن لەمافــە گــشتی وتایبەتــەكانی هاوڵاتیــان وناچــاركردنی حكومەت و دەوڵەت بـەرێزگرتن لـەو مافانـە ودابینكردنـی پێداویـستییە گشتیەكانی هاوڵاتیان وگوێگرتن لەداواكاری وفشارەكان .

دیموكراســی لەســەر بنــەمای وتووویــژی ئــازادو قەناعــەت پێكــردن وسازشكردن دامەزراوە چەختكردنی دیموكراتی لەسەر دیالۆگ وبەتـەنها قایـل بـوون نییـە بـەجیاوازی بـیروڕاو جیـاوازی بەرژەوەندییـەكان لـە زۆربەی پرسـە سیاسیەكاندا ، بـەڵكو ئـەوەش دەردەخـات كـە دەبێـت بـۆ دەربڕینی ئـەو جیاوازیانـەو گوێگرتن لێیـان رێـز دابنـێن .كەواتـە پـێش گریمانـــەی دیمـــوكراتی قبـــوڵكردنی هـــەبوونی فرەیـــی جۆراوجـــۆریی كۆمەڵگـەو یەكسانی هاوڵاتیـەكانێتی و، كـاتێكیش ئـەو جـۆراو جۆرییـە دەردەكەوێت كێشەكان بە رەوشێكی دیموكراتی چارەسەر دەكـرێن ، واتـە لە رێگـەی وتوویـژو قەناعـەتپێكردن وسازشـكردن نـەك بـە داسـەپاندنی ملهوڕانەی باوەڕ یان دەرخستنی دەسەڵات .

## دەستەبەرکردنی ئازادیە سەرەتاییەکان

دیموکراتی دەتوانێت پشتیوانی پاراستنی مافی ئازادی رادەربڕین و کۆڕوکۆبوونەوەکان وئاسایشی تاکەکەس و ئازادی کۆچکردن بێت ،چونکە هەبوونی ئەم مافانە بۆ پاراستنی بەردەوامی دیموکراتی زۆر بێویستە ، ئەومافانەش لە باشترین دۆخدا دەستەبەری گەشەکردنی تاکەکانی کۆمەڵن و دەبنە هۆی دروستبوونی روحیەتی بڕیاردانی بەکۆمەڵ، کە دەبێتە پێوەرێك بۆ دیاریکردنی بەهاداریی بەشێوەیەکی گشتی.

## *نوێکردنەوەی کۆمەڵایەتی

هەمیشە نوێکردنەوەی کۆمەڵایەتی جێ بایەخی دیموکراسی بووە، لەسیستەمە دیموکراتیەکاندا سیاسەتەکان، یان ئەو سیاسەت مەدارانەی کە هێندە کارامە نەبوون، یان سەردەمانی کارامەییان بەسەرچووە ،دوای رەوتێکی یاسایی و ئاشتی ئامێز لادەبرێن ،بەمجۆرە نوێکردنەوەی کۆمەڵایەتی بەبێ سەرهەڵدانی ئاژاوە، یان روخانی دەوڵەت کە بۆ بەرکەنارکردنی رژێمە نادیموکراتییەکان شتێکی حەتمەییە ،دەستەبەر بکرێت .

دیموکراسی چەن ئامانجی باشی لێدەکەوێتەوە کەبریتین لە :

1- دوورەپەرێزی لەدیکتاتۆری
2- مافی سەرەتای
3- ئازادی گشتی
4- مافی چارەی خۆنوسین
5- سەربەخۆیی ئاکاری (ئەخلاقی)

6- ئالگۆڕی مرۆڤی
7- پارێزگاری بەرژەوەندییەکانی تاکەکەس
8- یەکسانی سیاسی
9- ئاشتیخوازی
10- گەشەوو پەرە پێدان
11- هەڵکردن و یەکتر قبوڵکردن و قبوڵکردنی جیاوازییەکان

## گەڕانەوە بۆ پێشینەیەکی عێراق

گەر چاوێك بخشێنین بە رابردووی ئەم وولاتەدا، بە ئاشکرا ئەوە تێبینی دەکرێت کە ئەم وولاتە هیچ سیمایەکی مۆدێرنی نەبووەو یەکێك بووە لەو وولاتانەی ژێر دەستەلاتی بەریتانیا و هەر بۆ مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بەکارهێنراوە.

نەتەوەی کوردیش لە هەر چوار پارچەکەدا تووشی زوڵم و زۆر بووەو بەتایبەت لە کوردستانی باشووردا بە زۆر خرایە سەر عێراق بە هۆی فراوان کردنی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی بەریتانیا، دەسەڵاتە یەك لە دوای یەکەکانیش لە عێراقدا کەم و زۆر چارەسەرێکی ئەوتۆیان نەدۆزیوەتەوە بۆکێشەی کورد، بەڵکو بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ گەلی کورد لە ململانێ بوو تاکو مانگی نیسانی 2003 دا .

هاوکات کەس ناتوانێت سەرۆك کۆمارێکی دیکتاتۆری، وەك سەدام حسێن لە یاد بکات،کە دەرهەق بەخەڵکی عێراق سەدان جینۆسایدو رەشەکوژی وهەرەمەکی ئەنجامداوە ، لەوانە ئەنفالکردن

ولەناوبردنی زیاد لە (182)هەزار كورد لە ناوچە كورد نـشینەكان ، لـە نـاوبردن ودروسـت كردنـی گـۆڕی بـە كۆمـەڵ بـۆ سـەدان هـەزار كوردو عەرەب وكەمەنەتەوییەكانی تر.

لـە سـاڵی1988 شـاری هەڵەبجـەی كیمیابـاران كرد،كـە زیـاد لـە (5)هـەزار هـاوڵاتی شـەهید بـوون وزیـاتر لـە (10)هـەزار كەسـیش بریندارو ئالودە بەژەهر بوون .

بێجگـە لـە هەڵگیرسـاندنی چـەندین جـەنگی خوێنـاوی لـە گـەڵ دراوسێكاندا ، هەشت ساڵ جەنگ وكوشـتار لـە گـەڵ وڵاتـی ئێرانـدا ، داگیركردنی وڵاتـی كوەیت وجـەنگی یەكـەمی هاوپـەیمانان وجـەنگی دووەمی هاوپەیمانان ، كە لەم جەنگانەدا بەهۆی سەرەڕۆیی سەدامی دیكتاتۆرو تینوی داگیركاری سـەدان هـەزار سـوپای نیزامـی وخـەڵكی بێتاوان كوژران ولە ناوچوون .

حكومەتی بەعس لە ماوەی حوكم كردنیاندا هۆكارێكی سـەرەكی تێكدانی كەلتوری شارەكان بووە و نەهێشتنی شارسـتانیەت بـووە بـە هۆی تێكدانی زیاترلە 4500 هەزار گوند لە ناوچـەی كوردسـتاندا و گواستنـەوەیان بۆ شارەكانی كوردستان، دوای ئەنفال كردنـی كـور و كچە گەنجەكانی، ئـەم پرۆسـەیە بـوو بـە مایـەی ئـازارو ئەشـكەنجەو سەرلێـشێوانی هـەزارەها خێزانـی كـورد كـە تـاكو ئێـستا گـەلی كـورد پێوەی دەناڵێنێت.

مێژووی كورد لە كوردستانی عێراقدا هەموو ژیانی بە ململانێـی لەگەڵ دەسەڵاتە یەك لـە دوای یەكـەكانی عێراقـدا بردۆتـە سـەر، وە هەر لە چاوەڕوانی بەدیهێنانی مافە سیاسی یەكانی بـووە، ململانێـی سیاسـی لـە رێگـەی خـەباتێكی چـەكداری یـەوە كـراوە لـە جێگـەی خەباتێكی مەدەنی مۆدێرن ، نـەبوونی دیموكراتی‌یـەتیش هۆكارێـك

بووە كە هەموو خەڵكی كورد خەون ببینن بە دەرئەنجامی خەباتی چەكداری پارتە سیاسیەكان.

## لە سوودەكانی دیموكراتیەت .

1- دیموكراسی یارمەتی دەرە بۆ نەهێشتنی دیكتاتۆریەت

2- دیموكراسی مافە سەرەكیەكان بۆ هاولاتیان مسۆگەر دەكات ، كە رژێمە نادیموكراسییەكان ئەوەیان ناوێت ، یان ناتوانن دانیان پێدا بنێن .

دیموكراسی تەنیا پرۆسەیەكی حكومكردن نییە ، بەڵكودیموكراسی لە ناخی خۆیدا سیستمێكی یاسایشە ،یاسا توخمێكە پێویستیەكانی دروستكەری پرۆسەی بە دیموكراسیكردنی دەوڵەت .

3- دیموكراسی بۆ هاولاتیان فرە ترە و ئازادی تاكەكەس مسۆگەر دەكات .

4- تەنها حكومەتی دیموكراتی دەتوانێت زۆری دەرفەت برەخسێنێت بۆ كەسەكان تا ئازادانە چارەنووسی خۆیان دیاری بكەن ، واتە بە پێی یاسایەك كە خۆیان هەڵیدەبژێرن بژین .

5- تەنیا حكومەتێكی دیموكراتیك دەتوانێت یارمەتی گەشەی یەكسانی سیاسی بدات.

6. دیموكراسی یارمەتی خەڵك دەدات تا بەرژەوەندی سەرەكییان پارێزگاری بكەن.

سیستەمی پەرلەمانی باشترین سیستەمە كەتائێستا بۆكۆنترۆڵكردنی دەوڵەت گەڵاڵە كراوە،ئەویش لەهە لو

مەرجێکدا کەڕێژەی دانیشتوان زۆر زۆر بێت وخەڵکیش دەرفەت و مافی ئەوەیان نەبێت بەشێوەیەکی بەردەوام هەمووکاتێ خۆیان بۆپرسە سیاسی یەکان تەرخان بکەن . ئەم تیۆرە پێی وایە کەلەم سیستەمەدا خەڵکی لەگەڵ هەڵبژاردنی سەرۆکی حکومەت (سەرۆك کۆمار ،یان سەرۆك وەزیران)وەهەڵبژاردنی ئەندامانی دەسەلاتی یاسادانان دەتوانن چاودێری حکومەت بکەن ، چونکە پەرلەمان بەکەڵك وەرگرتن لەدەسەلاتی خۆی بۆ پەسەندکردن یان ڕەتکردنەوەی یاساکان وشێوەی دارایی بەندی، دەتوانێت بەردەوام لەرێی خەڵکییەوە چاودێری حکومەت بکات.

لە مێژووی کورددا و بۆ یەکەم جار لە سالی 1992 هەلبژاردن کرا، لێرەدا هەڵبژاردن وەکو ئامرازێك بە کارهێنرا بۆ دەستنیشان کردنی دەسەلاتی پارتە سیاسییەکان. بەهۆی نەبوونی ئەزموونێك و تێنەگەیشتنی باشی جەماوەر بۆ دیموکراسیەت و هەڵبژاردن زۆر بە ئاسانی و بە هۆی شەڕە ناوخۆییە یەك لە دوای یەکەکانی کوردستان ئەو مێژووە پر شکۆیەی کورد سڕایەوە .

زۆر مەحاڵە بە کۆمەلگەی کوردی بوترێت کۆمەلگەیەکی مەدەنی، چونکە تاکو ئێستا هوشیاری سیاسی بە لاوازی ماوەتەوە، خەڵکی بێ بیرکردنەوە روو دەکەنە سندوقەکانی دەنگدان و هەڵبژاردن لەسەر بنەمای سۆزداری بۆ ئەو حیزبەی کە لە پێش دەنگدان بە هەفتەیەك یان دوو هەفتە پەیمانی پرۆژەیەك دەدەن، یان خزمێك یان کەسێك لە خێڵەکە لەو حیزبە و بەو شێوەیە.

لەژێر سایەی دیموکراسیدا هەرکە هەڵبژاردن تەواو دەبێت لیستە هەڵبژێرراوەکان گوێی خۆیان دەخەوێنن لە پێداویستییەکانی هاوڵاتیان، هاوڵاتیانیش لای خۆیانەوە بە بێ هیچ گۆرانکارییەك لە

کێـشەکانی دوای هەڵبــژاردن چـاوەڕێ یـەکی زۆری حیزبـەکان دەسـتەو ئەژنۆ هەست بە هەڵخەڵەتان دەکەن و دووچاری بێ ئومێدی دەبن.

ئەمە جگە لەوەی کەلە ژێر پەردەی دیموراسیدا, 62٪ ی ئەو ژنانەی کە چاوپێکەوتیان لەگـەڵ کـراوە لـە کۆمـەڵگای توێژینەوەکـەمان لـە نـاو شاری کەرکوك و دەوروبەری بڕوایان بە پرۆسەی هەڵبژاردن نىیە.

52٪ بروایان وایە بە شێوەیەکی دیموکراتیانـە ناکرێت و 21٪ ژنـان رێگــەی پــێ نــەدراوە بەشــداری هەڵبــژاردن بکات،ئــەوەی لێــرە روون دەبێتــەوە ئەوەیــە کــە تــەنها کــار بــۆ ســەلماندنی دیموکراتیــەت هەڵبژاردنەکان نىیـەو زۆرمـافی تـر زەوت کـراوە و بەتایبـەت مافـەکانی ژنان، کە نەتوانێت دەستەبەری سـەرەتاترین مـافی خـۆی بکـات ئـەویش دەنگدانە.

## ژن و بەشداری سیاســـی

دەتـوانین پێناسـەی سیاسـەت بکـەین بـەوەی کـە کەرەسـتەیەکە بـۆ چاککردن و رێکخستنی کاروباری گشتی کۆمەڵگا بەرەو باشتر کـە ئامـانج تیایدا بەرژەوەندی تاك بە تایبەتی و کۆمەڵگایە بـە گشتی. ئەمـەش لـە پەیوەندی نێوان خاوەن دەسـەڵات و رەعیـەت داخـۆی دەبینێـت بـە پێـی تیۆرە جیاجیاکان کە باس لەم پەیوەندییە دەکەن, کە پێویستە خـاوەن دەسەڵات، سەربە هەر نەتەوەیەکە ، هەر ئاینێکە، رەشە یان سپی بە بـێ جیاکاری ئەو مافەی هەبێت.

ئەوەی کەدەکرێت لێرەدا ئاماژەی پـێ بـدرێت بـە درێـژای بـە هـەموو شێوەیەك هەرچی دەسکەوت هـەبوو لـە ژن سـەندرایەوە و پیـاو بـوو بـە خاوەن دەسەڵات, ئەم دیاردەیە لە دوای قۆناغی مرۆڤی سەرەتایی سـەری هەڵداوە ، ئەو کاتەی ژن وەکو خواوەندی جوانی و بەرهـەم و داهێنـەر و دروستکاری منداڵ, وەکو بوونەوەرێکی پیرۆز تەماشا دەکرا.

دوای قۆناغی دایك سالاری قۆناغێکی دوورو درێژ لـە چەوساندنەوەو زەبـرز زەنـگ و بـەکاڵاکردنی ژنـان دەسـت پـێ دەکـات و لـە هـەموو بوارەکـانی ژیانـدا ژنـان کـەمتر لـە پلـە دوو تەماشـا دەکـرێن, هـەر لـەو کەلتورە باوك(پیاو) سالارییەدا ژن بە کـەم عـەقڵ و نەشـارەزا بـێ توانـا دەناسـرێت وەك وەسـیلەی رابـواردن سـەیردەکرێت ، ئەمــە بــە باشــی دەردەکەوێت لە قۆناغەکانی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی و تاکو ئێستاش بەشێوەیەکی فراوان بەدی دەکرێت لە جیهاندا، وە بەگوێرەی راپۆرتێکی تایبـەتی سـەبارەت بـە کۆبوونـەوەی جیهـانی ژنـانی سـاڵی (2004) لـە سیئۆل دەرکـەوتووە کـە تـاکو سـاڵی (2004) دا تـەنها (11) ژن پۆسـتی سـەرۆکایەتیان وەرگرتـووە کـە حـەوتیان سـەرۆکی وولاتـن و چـواریان

سەرۆك وەزیرانە، ئەو یازدە وولاتەی كە ژن تیایدا پۆستی سەرۆكایەتی هەیەنوێنەرایەتی 5,6٪ ی جیهانن. تەنها 1.008 ی ژنانی جیهان دەسەلاتی سیاسیان هەیە بە پۆستی وزاری لە حوكمەتەكانی جیهاندا. وەكەمترین ژمارەی وەزیری ژن هەیە لە مەجالی سیاسیدا بە رێژەی 9.5٪، لە كاتێكدا 55.2٪ لە بواری كۆمەلایەتی، 9.9٪ لە بواری تەنفیزی، و 17.9 لە بواری ئابوریدا كاردەكەن.

هەر بەم پێیە دەتوانین بلێین كە كێشەی ژن كێشەیەكە سەرانسەری جیهانی گرتۆتەوە ، جا گەر مەبەستەكەمان لە رووی بەشداری سیاسی مێینەدا تەسك بكەینەوە دەبینین لاوازی بەشداری مێینە لە كاری سیاسیدا گرفتێكی جیهانی یەو شوێن باس و لێكۆڵینەوەلە جیهاندا بەلام بە پلەی جیواز كە رێژەكەی لە وولاتێكەوە بۆ وولاتێكی تر دەگۆرێت.

بێگومان لاوازی بەشداری كردنی ژنان لە كاری سیاسی د ا و دووركەوتنەوە لە ناوەندەكانی بریار بەربەستێكە لە پێش پێشكەوتنی كۆمەلگا، چونكە هەموو قورساییەكە كەوتۆتە سەر شانی بەشێكی كۆمەلگا كە پێك هاتووە لە پیاوان ، كە ئەركو بەرپرسیارێتی یەكانیان زۆر زیاترە لە تواناكانیان و بەشەكەی تر بە بێ دەسەلات ماونەتەوە، بە بێ بەشداری پێ كردنیان و سوود وەرگرتن لە تواناكانیان، پەراوێز كراون.

ژنی كوردیش لەم هەلومەرجە دا بێ بەش نەبووە لەو سووكایەتی پێ كردن و، وە كەلتوری كوردی مایەی سەندنەوەی ئازادی بووە لە ژنی كورد، هەردەم شەرەفی خێل و بنەماڵە بە شەرەفی ژنەوە پەیوەست كراوە، ژنی كوردیش بەم بیانووە بێ بەش بووە لە وەرگرتنی دەسەلات ،بەتایبەت لە ناوەندەكانی برِیاردانلدا و بگرە خاوەنی بچووكترین برِیار نەبووە كە پەیوەست بێت بە ماف و ئازادیەكانی وەكو مرۆڤێك,

نەیتوانیوە هیچ دەسەڵاتێکی سیاسی یان کۆمەڵایەتی هەبێت. و هەردەم گوێرایەڵی پیاو بووە و پیاو بریاردەری ژیانی ژنان و خێزان وکۆمەلگا بووە بە گشتی.

گەر ئاورێك بدەینەوە لە کاری سیاسی لە کۆمەلگای کوردیدا, دەبینین کە ئەم کۆمەلگایە لە ژێر دەسەڵاتی زنجیرە داگیرکاریەکاندا ژیاوەو دووچاری ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆر بووە تاکو گەیشتوە بەم ئاستەی ئێستای، وە ئەو بیرکردنەوەیە هاتۆتە کایە کە ئەم کۆمەلگایە ببرێت بەرەو ژیانی رۆژئاوایی بە بێ پشتگوێ خستنی رەسەنایەتی خۆی کە جودای دەکاتەوە لە کۆمەلگایەکی تر بەچەسپاندنی بنەما کەلتوری‌یەکانی سەرلە نوێ بۆ ئەوەی بتوانێت بوونی خۆی بسەلمێنێت بە شێوەیەکی بەهێز لەسەربنەمایەکی راست و درووست.

بۆ ئەنجامدانی گۆرانکاری‌یە کۆمەڵایەتی یەکان، بەرهەڵستکاری لەگەڵ داب و نەرێت دێتە کایەوە بەو شێوەیەی کە چۆن بتوانێت پارێزگاری لێ بکات و پێشی بخات؟ چی بهێڵێت و چی لابەرێت؟ بەڵام دەبێت بزانین کە گۆران لە داب و نەرێتدا بەترسناکترین هەنگاو دادەنرێت, چونکە داب ونەرێت بریتی‌یە لەو رووە کەلتورییە کەلەروانگەیەوە بنەماکانی رەوشت دادەرێژر ێت وەسیستم و میکانیزمی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی یەکان لە نێوان تاك و کۆمەڵ و لە نێوان کۆمەڵەکاندا و هەروەها دیاریکەری بنەمای کەسایەتی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانە, جا لە روانگەی ئەو ململانێیەدا کەلە نێوان گۆران و بنیاتنانەوەی کۆمەلگادا بەشێوەیەکی مەدەنی جیاوازی دەرفەتی کارکردن لە ژێر کاریکەرێتی داب و نەریتدا لە نێوان رەگەزەکانی کۆمەلگادا ( بە نێرو می ینە وە)بە زەقی دەردەکەوێت کە زیاتر دەرفەت بۆ رەگەزی نێر فراوانترە تاکو رەگەزی ژن،لە ئەنجامدا دەسەلات گرتنە

دەستی ڕەگەزی ژنـان بـە راشـکاوی خـۆی دەسـەپێنێت و رەگەزەکـەی تـر خـۆی لـە پـەراوێزدا دەبینێتـەوە و ئەمـەش کاریگـەری نەگـەتیڤی هەیـە بەسـەر هـەموو لایەنـەکانی تـری ژیـانی ڕەگـەزی ژنـان دا، هەرچـەندە بەشێوەی تاك و تەرا لـە لایـەن رەگـەزی ژنانـەوە، هەنـدێك جـم و جـۆڵ بینـراوەو دەبینرێـت چ لـە جیهـان و چ لـە مێـژووی کـورددا، نموونـەی ئەوەش ( **نەعیمە مستەفا**) ئـەو ژنـەی لـە شۆرشـی بـرایم خـانی دەلـۆدا شان بە شانی پیاوی کورد لـە سـەنگەردا بـووە و، نموونـەی دیکـەی وەکـو ( کوێخـا نیرگـز ، حەبـسەخانی نـەقیب، قـەدەم خێر،نـازەنین صـالح ، رووناك زوهـدی و درەخـشان عـارف) کـە هەریەکـەو بـە جۆرێـك رۆڵیـان هەبووە لە مێـژووی کورددا‌وشـوێن شـانازی بوون،بـەلام ئـەم ژمارەیـە لـە ژنان لەو ململانیّ یەی گۆڕاندا   وون دەبن  لە ناو جم و جۆڵە دەرفـەت پیّ دراوەکانی رەگەزەکەی تردا.

هـەروەها بەشـداری نـەکردنی ژنـان لـە سیاسـەتدا بـەمانای کـۆنترۆڵ کردنـی سیاسـەتە لەلایـەن پیاوانـەوە، کـە هـەموو کۆمـەلگا رووبـەڕووی دەرئـــەنجامی بڕیارەکـــانی پیـــاوان دەبنـــە بـــە بڕیـــارە پـــۆزەتیڤ و نەگەتیڤەکانــەوە، کــە گــەر ژنــان بەشــداری پــیّ بکرێــت ئــەو بڕیــارە سیاسیانەی کە پیرۆزیەکانی هەموو کۆمەلگا دەخاتە لایەکەوە دەشیا بەم حاڵەی ئـەمرۆ نەبوونایـە یـان هـەموو ئـەو شەڕوشـۆرە ناوخۆییانـەمان ڕووبــەرو نەبووایەتەوە،کەواتــە ئاڕاســتەکردنی کۆمــەلگا بــە بڕیــاری گروپێك و پەراوێز کردنی گروپێك خاڵی نەگـەتیڤی لێدەکەوێتـەوە، کـە لە کۆتایدا هەموو کۆمەلگا ئەو باجە دەداتەوە .

**گرنگترین ئەو هۆکارانـەی بـوون بـە هـۆی لاوازی بەشـداری ژنـان لـە سیاسەتدا**

سـەيركردنی ژنــان وەكـو نامووســی پيــاوان , هــەر كــە هەســتی موڵكـدارێتی لـەلای پيـاوان دەركـەوت و خواسـتەكانيان بـالابوو چـەمكی شەرەف شێوازێكی تری وەرگرت و زيـاتر پەيوەسـت كـرا بـە ژنانـەوە، لـە كاتێكدا لەپێشتردا هەردوو ڕەگەز پابەنـد بـوون بـە داب و نـەرێتی بـاوی خێلەكيەوە.

لە ژێر ناوی پاراستنی شەرەفدا ژنان لە ئازادی‌يەكانی بێبەشكرا و وە لــە بــچووكترين مــاف كــە هەڵبــژاردنی مــافی هاوســەرييە، وە پاراســتی پــەردەی كـچێتی بـووە بـە رەمـزی پاراسـتنی شـەرەفی پيـاو و بنەماڵـە. سەرەكی ترين كاری ژنان پارێزگاری كردنە لە جەستەی خۆی بۆ ئـەوەی پارێزگاری لەشەرەفی بنەماڵەكەی بكات و نەبێتـە لكەيـەك بـەناو چـاوی بنـەماڵەكەيەوە.

شەرەف پارێزی بوو بە بەهانەيـەك كـە ژنـانی بێبەشـكرد لـە ئـازادی يەكانی وەكو تاكێك لە كۆمەڵگا، بـۆ هـەمووده سـتێپێك بـۆ بـەرەو پـێش چوون لەسەر ژنان پێويست بووە بير بكاتەوە لەوەی لەو قۆناغەدا هـيچ شتێك نابێتە هۆكاری لكەداركردنی شەرەفی خۆی و بنەماڵەكەی؟.

رژێمـی بـەعس كـە زيـاد لـە چـل سـاڵ حـوكمی عێراقـی دەكـرد هـيچ هـەنگاوێكی نـەناوە بـۆ گۆڕانكـاری لـە هـەلو مـەرجی ژيـانی ژنـان و بـە مەدەنی كردنی كۆمەڵگا، بەڵكو هاوكار بووە بۆ خراپتر كـردن كۆمـەڵكا و رێگربووە لە بەردەم هەر گۆڕانكاری‌يەكدا. نموونـەی ئەمـەش دەركردنـی بريــاری 132 تايبــەت بــە حــەلاڵ كردنــی كوشــتنی ژنــان بــەناوی شۆردنەوەی شەرەف ( غسل عار).

هۆكارێكی تری لاوازی بەشداری ژنـان لـەكاری سياسـی دا دەگەرێتـەوە بۆ نەبوونی شارەزايی و دەرفـەت بـۆ ئـەم رەگـەزە، چـونكە كۆمـەڵگا كـە پياو تيايدا بەشێوەيەكی سەرەكی بڕيـاردەرە و ئـەم كـارە بـە كـاری ژنـان

یان كچانی نابینێت, وە تەماشای ئەم رەگەزە دەكات وەكو كەسێكی كەم توانـاو ئـەو متمانەیـەی پـێ نابەخـشێت بـەڵكو كـاری سـەرەكی ژنـان هەڵسوراندنی كاروبـاری ناومـاڵ و منـداڵ هێنـان و بـەخێوكردنێتی كـە هەمووی بە كارێكی لاوەكی دادەنرێت,

لەهـەمان كاتـدا زۆربـەی ژنـان هەسـت بـەو چەوسـانەوەیەناكەن كـە رووبـەڕوویان بووەتـەوە و بووەتـە هـۆی لاوازی بەشـداری كردنیـان لـە هەموو بوارەكـانی ژیـان بـە بەشـداری سیاسیـشەوە، ئەمـە ئەوەنـدەی تـر گۆمەكە قووڵ دەكات و رێگەی زیاتر خۆش دەكات بۆ رەگـەزی بەرامبـەر ئـەو هەلـە بقۆزنـەوە و زیـاتر هێـز و دەسـەڵات بگرنـە بـەر بـۆ ئاراسـتە كردنی خێزان و كۆمەڵگا بە ویـستی خۆیـان و ژنـیش وەكـو بەشـێك لـەو موڵك و ماڵانەی كە خاوەندارێتی دەكەن.

گـەر باسـێكی **خوێنـدەواری** رەگـەزی مـێ بكـەین لـە كۆمەڵگاكەمانـدا دەبینین ئەم رەگەزە جارێكی تر بەهۆی كۆمەڵێك هۆكارەوە  ژمارەیەكی زۆر و بەتایبەت لە گوندەكان بێ بەش بوون لە تـەواو كردنـی خوێنـدن، لەوانــە كــەمی دەرفــەت بەخــشین بــە رەگــەزی مــێ بــەهۆی بــەگرنگ نەزانینی رۆڵی ژنـان  لـە پرۆسـەی بڕیاردانـدا،وە بـە پێویـست نـەزانینی خوێندەواری بۆ ئەم رەگەزە، لـە هـەمان كاتـدا گـەر ئامـانج لـە خوێنـدن كارئاسانی دەرفەتی كار بێت، جارێكی تـر كۆمـەڵگا نـان پەیـدا كـردن بـە كـاری پیـاوان دەزانێـت و بـە پێویـستی نازانێـت رەگـەزی مـێ بـۆ ئـەو ئامانجەش بخوێنن.

یـەكێكی تـر لـە هۆكارەكـانی زۆری ژمـارەی نەخوێنـدەواری لـە نـاو رەگـەزی مێینـەدا ئـەو كارەسـاتە یـەك لـە دوای یەكانەیـە كـە دووچـاری خــەڵكی كوردســتان بــوە، لــە جینۆســاید و كیمیابــاران و ئــەنفال و رووخاندنی گونـدەكان و ئـەو زوڵم و زۆرەی دوو چاری ژنـان بـووە دوو

ئەوەنـدەی ئـەوە ڕووبـەڕووی پیـاوان بووەتـەوە، بۆیـە ژن جارێـك وەكـو مرۆڤـ چەوساوەیەو دواتریش بەپلەدوو حساب كـراوەو مامەڵەی لەگـەڵ كراوە .

هەرچەند خوێنەواری لە وولآتی ئێمـەدا بـەو ئاسـتە دڵ خـۆش كـەرە نی یـە كـە هوشـیاری سیاسـی تاكـەكان زیـاد بكـات، بـەلام دەرفەتێكـە بـۆ چوونە دەرەوەی ژنان و رزگاربوونی لەو سجنەی كە بۆی درووست كراوە بە بیانووی پارێزگاری كردن لە شەرەفی خێزان و هەموو ئەو ئەركانـەی كە لە ناوەوەی خێزان بۆی ڕیز كراوە، كە هیچ نرخێكی ئابووری نىیە , هەروەها رێگایەكـە بـۆ دەستگەیـشتن بـەو زانیاریىیانـەی كەلـە رێگایـەوە ژنان رۆشنبیر دەكات.

كـاركردنی ژنـان لـە دەرەوەی خێزانـدا ئاسـانكاری دەكـات لـە رێگـای زیادكردنی بەشداری سیاسیان، چونكە یەكێك لە خاڵـە سـەرەكی یـەكانی ژێردەسـت كردنـی ژنـان سـەربەخۆ نـەبوونی ئابوورییـە و بەشـداری نەكردنێتی لە بڕیارداندا، ئەمە ئـەوە ناگەیـەنێت كـە ژنـانی كۆمـەلگای كـوردی، كـە بووبـە خـاوەن داهـاتێكی سـەربەخۆ بـەهۆی ئەنجامـدانی كارێـك لـە دەرەوەی خێـزان, سـەربەخۆی تـەواوی بەدەسـت هێنـاوە لـە خەرج كردنی داهاتەكەیدا، چونكە نموونـەی ئاشـكرا هەیـە كـە زۆربـەی زۆری ژنان كاتێك مووچەكانیان وەردەگرن دەیكەنـە چـنگی پیـاوانی نـاو خێزان، بەلآم بە بوونی بە خـاوەن مووچـەیەك هەسـت بـە متمانەیـەكی زیاتر دەكات لە رووی دەروونی یەوە.

**بەشێوەیەکی گشتی ئارامی[1] مرۆیی لە هەر کۆمەڵگایەکدا لە سێ تەوەر پێك دێت، کە یەکێك لەو تەوەرانە پەیوەستە بە لایەنی سیاسیییەوە کە بە (ئارامی سیاسی )ناودەبرێت ، دووەمیان پەیوەستە بە ئابووریییەوەو بە (ئارامی ئابووری ) ناودەبرێت،سێهەمیشیان بە لایەنی دەروونی گشتی کۆمەڵگاوە پەیوەستەو بە ( ئارامی دەروونی یان کۆمەڵایەتی)[2] ناودەبرێت.**

**هەریەك لەم تەوەرانە واتا پێکهاتەکانی ئارامی کاریگەرێتیان لە نێو خۆدا بەسەریەکەوە هەیە،بۆ نموونە ئاڵۆزی بارودۆخی سیاسی لە وولاتدا کاریگەرێتی راستەوخۆی هەیە لەسەر لایەنی ئابووری و ئالۆزی هەردوو لایەنی ئابووری و سیاسی کاریگەرێتی بەرچاویان دەبێت لەسەر لایەنی دەروونی کۆمەڵگا،وەك دڵە راوکێ، نائارامی، بێزاری، وە بە پێچەوانەوە ، کەواتە هەرکۆمەڵگایەك گەر کەسەکانی دووچاری هەر گیروگرفتێکی دەروونی هاتبێت لەئەنجامدا ناتوانێت بەرنامەیەکی سیاسی نەگۆر بۆ وولات دارێژێت، یان بەدەستهێنانی ئابوورییەك، کە بتوانێت پێداویستییەکانی مرۆڤ لە ژیاندا بە شێوەیەی پێویست دابین بکات.**

**لێرەوە دەتوانین بڵێین شلەژانی باری سیاسی عێراق لە ساڵانی رابردوودا ئەوڕاستیانەی سەرەوە روون دەکاتەوە و کاریگەری**

---

[1] ووشەی ئارامی زاراوەیەکە لە ووشەی ( بیمە) بە واتایپاراستن وەرگیراوە، پاراستن بریتی یە لە بەربەست دانان بەرامبەر ڕوودانی هەر ناتەواوی یان ئاڵۆزی یان هەرەشەیەك.

[2] مەیەست لە ئارامی دەرونی ئەوەیە کە کۆمەڵێك سیستم و بەهاو تێگەیشتەی فراوان کە لە هزرێکی کۆمەڵیدا بێت وەکو یارمەتی دەرێك بێت تاکو کۆمەڵەکان لە مامەڵە لەگەڵ ئەو فشارانەی کە هەیە دەبنە رێگر بەرامبەر بە هەست کردنیان بە بارودۆخی هستیریاو ئاڵۆزی لە ژیاندا.

راستەوخۆی لەسەر داڕووخانی ئابووری وولاّت هەبووەو پێکەوە کاریگەری نەگەتیڤیان هەبووە لەسەر تاکەکانی کۆمەلگا، ئەم کاریگەرییە زیاتر دەردەکەوێت لەسەر ژنان، هەولّ دەدەین ئەوکاریگەرێتیە لەچەند لایەنێکەوە ڕوون بکەینەوە

1. بەها کۆمەلاّیەتی یەکان:

بەشێوەیەکی گشتی بەهاکۆمەلاّیەتی یەکان لە رێگەی پێکەوە ژیانی کۆمەلگاوە بەدی کراوە و زۆر جار ئەو بەها کۆمەلاّیە تیانە گەشەو رێکخستن و داڕشتنەوەی تازەی بۆ کراوە تا ئاستێك کە بەشێوەیەکی گشتی وەربگیرێت و پابەند بکرێت لە لایەن کەسەکانەوە وەکو پێوەرێکی دەروونی لە تاکدا دێتە کایەوە بۆ ژیانی کۆمەلگا، لەو چوارچێوەیدا تاکەکانی کۆمەلگا بەشێوەی پابەندبوون هەلّسوکەوتی تێدا دەکەن.

بەلاّم لە کۆمەلگای عێراقیدا بەهۆی داڕوخانی باری ئابوری و کۆمەلاّیەتی و سیاسی زۆر لەو بەهایانە لە کیس چوون و کاری پێ ناکرێت, کۆمەلگایەکی ماددیو هەستی نەکردوو بە لێپرسینەوە، خاوەن کەسێتی لاواز و سوکایەتی کەر بە هەموو هوشیارییە مرۆیییەکان دەبینین و رەنگدانەوەی ئەو شێوە بیر کردنەوەیە و مامەلّەپێ کردنی لەگەلّ ژنان دا وەکو هەڕەشەیەك دەبێت بەرامبەر بەبەشداری ژنان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا و بەتایبەت لە بواری سیاسیدا.

2. ژن لە هزری پیاوسالاریدا

شارستانیەتی عەرەبی بەگشتی و شارستانیەتی عێراق بەتایبەتی هەر لەسەرەتای دروست بوونیانەوە لە پێش ئاینی

ئیسلام شارستانی‌یەتێکی پیاوسالارانە بووە، کە تیایدا پیـاوان رۆڵـی ژنان دیاری دەکەن و بە پلەی دووەم دێن

و بەم شێوانەی خوارەوە یاساکان دارێژراوە:

پیــاو ( باڵادەســتە، بەخێوکــەرە، بریاردەرە،لــەزەت وەرگــرە، هەڵەکانی رێپێدراوە) لە کاتێکدا ژن( جێبەجێکـەرە، بـەخێوکراوە، گوێ ڕایەڵە،هۆی لەزەتە،هەڵەکانی جێی سزایە). بەم شـێوەیە رۆڵـی ژنان چەسپاوە لە مێشکی پیاوان دا ئەم ئەنجامانەی لێ بووەتەوە:

أ. ژن دووچاری سەرکوت کردن و چەوساندنەوە و پێـشێل کردنی مافەکانی بووە.

ب. زیاتر تووشی ڕاڕایی و هەست نەکردن بە ئارامی بوە بە هۆی کاریگەرێتی رووداوە سیاسیەکان.

ت. ئەم گۆڕانە سیاسی یـە کتـوپڕەی کـە لـە کۆمەڵگاکـەمان رووی داوە نابیتــە هۆکـاری گۆڕانکاری‌یـەکی خێـرا لـە سرووشـتی تیڕوانینــی پیـاوان بـۆ رۆڵـی ژنـان و تـەنها رێگـاش هەوڵـدانی ژن خۆیەتی بـۆ فێربـوون و وەرگرتنـی مافـەکان و تێکـشکاندی بـەها کۆمەڵایەتی یە رێگرەکان لە پێش بەشداری ژنـان لـە بڕیـاردان و کاری سیاسیدا.

3. تێڕوانینی ژنان بۆ رەگەزەکەی خۆی .

رۆڵی ژن لە ژیانداو لـە رۆژی لـەدایك بـوونی یـەوە لـە روانگـەی دوو هۆکــارەوە دەچەســپێت ، یەکــەمیان پێکهاتــەی بــایۆلۆژی و دووەمیان ژینگەی چـواردەور، بـەهۆی رەگـەزی نێرینـە لـە ژینگـەی چواردەوردا دەرئـەنجام بیرۆکـەی تەسـلیم بـوون لـە هـزری مێینـەدا جێگیر بوو, کە بەرەو دەسەڵاتدارێتی هەست کردن بە پاشکۆ بـوون و گوێڕایەڵی بۆ نێرینە,لەگەڵ ئەو هەولانەی کە داوێتـی بـۆ دەربـاز

بوون لە فشاری نێرینە بەلام هیچ دالدەیەکی بەدی نەکرد تەنها ئەوەی هەولبدات رووبەڕووبوونەوەی نێرینە نەکات.

بەڵام ئەم تێڕوانینەی مێینە لە کۆمەلگای رۆژئاوایدا کەم بووتەوە لە ئەنجامی گەشەکردنی مێینەکانیان و هەولدان بۆ یەکسانی خۆیان، کەچی تاکو ئێستا رەفتاری مێینەی رۆژهەلات، وە بە تایبەت لە کۆمەلگای ئێمەدا وەکو خۆی ماوەتەوە و لە بیرێکی وادان کە( مێینە دروست بووە بۆ ئەوەی خۆشی درووست بکات بۆ مێرد و خێزان)، ناتوانێت تێکەڵاوی پیاوان بکات و سنووردار بووە بۆ ئەو تێکەڵاوییە و ئارامی دەروون لە هاوسەرێتی دەبینێتەوە بۆیە هاوسەرێتی بووە بە ئامانجێکی سەرەکی لە ژیانیدا پێش هەموو ئامانجێکی تر وەکو خوێندن، پێگەیەکی ئابووری، یان کارێکی سیاسی، تەنها پێوەرێکە بۆ پاراستنی شەرەف و رەفتاری چاودێری دەکرێت لە لایەن کۆمەڵەوە.

## بەشـــــــی سێیەم

## هەنگاوە مەیدانیەکانی توێژینەوە

-میتۆدی توێژینەوە:

کۆمەڵگای توێژینەوە:

سامپڵی توێژینەوە:

ئامرازی توێژینەوەکە

کەرەستە ئامارییەکان:

## میتۆدی توێژینەوە:

لەم توێژینەوەیەدا میتۆدی وەسفی بەکار هاتووە، ئەویش بەشێوازی رووپێوی کۆمەڵایەتی، لەڕێگەی وەرگرتنی سامپڵەوە، لەناو شاری کەرکوك و ناوچەکانی سەر بەم پارێزگایە، چونکە رووپێوی لەرووی سامپڵەوە ئەو رێگەیەیە، کەسەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگای توێژینەوە وەرناگرێت، بەڵکو بەشێك، بەشێوەیەکی زانستی هەڵدەبژێرێت بەمەرجێك نوێنەرایەتی هەموو سیفات و خەسڵەتەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا بکات( الحسن، 1971: 430)، ئەمەش لەبەر سنورداری توانا مادی و مرۆیی و لۆجستییەکانی رێکخراوی پەنا، کە نەدەکرا سەرجەم ژنانی عێراق لەناو نوێژینەوەکەدا جێگە بکەینەوە، لەبەر ئەوە سامپڵمان لەو ناوچەیە وەرگرتووە.

## کۆمەڵگای توێژینەوە:

سەرجەم ئەو ژنانە لەخۆ دەگرێتەوە، کە لەماوەی ئەنجامدانی توێژینەوەکەدا چاومان پێیان کەووتووە، لەناو شاری کەرکوکدا گشت ئەو گەڕەکانەمان وەرگرتووە، کە دەکەونە ناو سنوری شارەوانی کەرکوکەوە، هەروەها مەڵبەندی هەموو قەزاکانی (داقوق، دوبز)، بەهەموو ناحیەو گوندەکانییەوە.

## سامپڵی توێژینەوە:

دوابەدوای دەستنیشانکردنی کۆمەڵگای توێژینەوە، بەپێی ئەو ئامارەی لەبەردەستماندا بوو، رێژەی زیاتر لە 5%ی گشت دانیشتوانی ناوچەی دیاریکراومان وەرگرتووە، شایەنی باسەی ئەم رێژەیە هەموو

دانیشتوان دەگرێتەوە، بەڵام بەپێی ئامانجی توێژینەوەکەمان تەنها ژنانمان وەرگرتووە، ئەویش ئەو ژنانە وەرگیراوە، کەلەکاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکەدا لەو ناوچەیەدا ژیاون، کەواتە رێژەی سامپڵی توێژتنەوەکەمان زۆر لە 5٪ زیاترە، لەبەر نەبوونی ئامارێکی وورد، نەمانتوانی سامپڵی توێژینەوەکەمان دیاری بکەین.

## وەسفی سامپڵی توێژینەوە:

سامپڵی توێژینەوەکەمان، بەشێوەیەکی هەرەمەکی(عشوائی) وەرگرت، ژمارەو رێژەی سامپڵ بەپێی گۆڕاوەکانی ناوچەی جوگرافی، تەمەن، ئاستی خوێندن، شێوازی نیشتەجێبوون، روون کراوەتەوە

ئامرازی توێژینەوەکە:

## ئامادەکردنی ئامرازی توێژینەوە:

بەمەبەستی کۆکردنەوەی داتاو زانیاری لەسەر بەشداریکردنی سیاسی ژنان‌و بۆ هێنانە دی ئەو ئامانجانەی بۆ ئەم توێژینەوەیە دانرابوون، فۆرمێکی راپرسیمان (**إستمارة الاستبيان، Questionnaire**) ئامادە کرد، پرۆسەی ئامادەکردنی فۆرمەکەش بەم هەنگاوانەدا تێپەریووە:

1/ سەرەتا فۆرمێکی (21)برگەیی داڕشت، بۆ پێکانی ئەو ئامانجانەکانی ئەم توێژینەوەیە (( وەك لەپاشکۆی ژمارە یەکدا بەرچاو دەکەوێت))

2 /لەهەنگاوێکی تردا، بۆ مەبەستی دەرهێنانی راستگۆیی فۆرمی راپرسیەکە، شێوازی راستگۆیی رواڵەتیمان گرتەبەر، ئەویش بەوەی

فۆرمەکە پیشانی چەند پسپۆرو شارەزایەك درا، بەمەبەستی هەڵسەنگاندن و هەمووارکردنی، وەك لە پاشکۆی ژمارە دوودا هاتووە))، ئەوانیش سەرنج و تێبینی خۆیان داو گۆڕانکاریان بەسەر هەندێك لەبڕگەکاندا هێناو هەندێکی تریان لابرد، لەکۆتایدا فۆرمەکە 18 بڕگەی مایەوە(( وەك لە پاشکۆی ژمارە دوودا هاتووە)).

## جێبەجێکردنی ئامرازی توێژینەوە:

لەپاش وەرگرتنی پشگیری و مۆڵەتی لەلایەن دەزگا بەرپرسەکانەوە (وەك لەپاشکۆی ژمارە سێدا هاتووە)، فۆرمی راپرسییەکە، لەدوا شێوەیدا، بەسەر ئەندامانی سامپڵی توێژینەوەکەدا دابەشکراو وەڵام درایەوە، لەماوەی هەژدە رۆژدا، لە 2006/2/3 بۆ 2006/2/20، ئەم پرۆسەیە لەلایەن (6) تیمەوە جێبەجێ کرا، کە پێکهاتبوو لە(27) ئەندام ( وەك لەپاشکۆی ژمارە سێدا هاتووە) لەناوچەی کەرکوك و قەزاو ناحیەو گوندەکانی.

## راستکردنەوەی فۆرمی راپرسی:

بەمەبەستی هەموراکردنی وەڵامە وەسفیەکان، تاکو لەڕوی ئامارییەوە چارەسەر بکرێن، هەستاین بەپێدانی سەنگی ژمارەیی بەوەڵامی سەرجەم بڕگەکانی فۆرمەکە، لەم پرۆسەیەشدا پشتمان بەلۆژیکی جیاکردنەوەی بەشداریکردنی سیاسی ژنان بەستووە، هەروەها لەسەر بنەمانی بەشداریکردن و یەشدارینەکردنی ژنان لەهەڵبژاردندا، پرۆسەی جیاکردنەوەی وەڵامەکانمان وەرگرت و رێژەی

سەدیمان بەهەموووەڵامەکان بەخشی ا(( وەك لەپاشکۆی ژمارە پێنجدا هاتووە)).

بۆ حوکمدان بەسەر رادەی (بەشداریو بەشدارینەکردن)، لەسەر بنەمای بەرزترین رێژەی سەدی ، ناوەندێکی تیۆریمان بۆ هەردوو رادەکە دەرهێناوە، ئەمەش بەو مەبەستەی لەحاڵەتی توندڕوەییو پەرگیری وەڵامەکان دوور بکەوینەوە، چونکە لەم توێژینەوەیەدا، لەسەر بنەمای گروپ، نەك تاکەکەس، بوونو رادەی بەشداری سیاسی دەخەینە روو.

## کەرەستە ئامارییەکان:

لەم توێژینەوەیەدا ئەم کەرەسە ئامارییانە بەکار هاتووە:

رێژەی سەدی بۆ دیاریکردنی رێژەی گروپەکان لەناو سامپڵی توێژینەوەدا، بەپێی ئەم یاسایە(منصور، 2000 :6)

$$\frac{\text{بەش}}{\text{گشت}} \times 100$$

سەرچاوەکان:

1- الحسن، عبدالباسط محمد، اصول البحث الاجتماعی، 1971، ط3، مكتبة الانجلو المصرية.

2- مەجید، ڤیان، سستمەکانی هەڵبژاردن و پرانسیبەکانی دەنگدان، مەکتەبی بیر و هوشیاری، چ 1، 2005.

3- کاڤاك، دەنیس، ململانێی هەڵبژاردن، و: ئەبوبەکر خۆشناو، مەکتەبی روناکبیری ی.ن.ك، 2005.

4- امم المتحدة، القضاء على جميع أشكال التمييز ضد المرأة، 1981، موقع امم المتحدة على انترنيت.

5- الانترنيت.

6- نيوف، صلاح، الحوار المتمدن - العدد: 731 - 2004 / 2 / 1.

7- صالح، بيان، موقع ميدل است ئونلاين، 2006.

8- حەمە ساڵح، محەمەد، جینۆساید لە عێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد.

**خشتەی ژمارە (1)**

لـە خـشتەی ژمـارە (1) دا دەرخـستەی تەمـەن دەردەکـەوێت، کـە لـە (18) ساڵەوە تـا سـەرو 47 سـاڵ لـەخۆ دەگرێ، بایـەخی دەرخـستەکە لەوەدایـە کـە لەنێوان هەر پێنج سـاڵ مـاوەدا وەرگیراوەکـان بەشـێکی زۆریـان لـە یەکدیـەوە نزیکن.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (1) بڕوانە پاشکۆکان

**خشتەی ژمارە (2)**

لـەم خـشتەیەدا بەشـدلربوان بـەپێی شـوێنی دانیـشتن دابەشـکراون کـە لـەناو شـاری کەرکوکـدا 63٪ ی فۆڕمـەکان پـڕ کراوەتـەوە، ئەمـە جگـە لـە قـەزاو ناحێ‌و گوندەکان. کە لەو شوێنانەش فۆڕم پڕ کراوەتەوە، جگە لەناحێی تازە خورمـاتو کـە دەسـەڵاتدارێتی ئـەوێ ڕێگـای بەتیمـەکانمان نـەدا فـۆڕم پـڕ بکەنەوە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (2) بڕوانە پاشکۆکان

**خشتەی ژمارە (3)**

لەم خشتەیەدا بەشداران بەپێی باری خێزانیان دابەشکراون، ئەوانـەی شـویان کـردووەو هاوسـەریان مـاوە 59٪ بەشـداران‌و کـچان 29٪ و بێـوەژن 12٪ ی بەشداروانە بونـە. بـەپێی ئامارەکان ئـەوە دەردەکـەوێت کـە ئـەو ژنانـەی کـە هاوسـەرگیرییان کـردووە بـواری بەشـداری کردنیـان لـە هەڵبژادنەکانـدا زیـاتر بووە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (3) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (4)

کۆی نەخەخوێنەوار لە سەرجەم ژمارەی بەشدار بوان کە 3851 کەسەو 36٪ و ئاستەکانی دیکەش 64٪ی تەواوی بەشداران پێکدەهێنێ کە لەناویاندا لەهەموو ئاستەکانی خوێندن لەخوێندەواریی ئاسییەوە تا دەرچووی پەیمانگاو زانکۆ هەیە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ژنانی خوێندەوار زیاتر بەشداری هەڵبژاردنەکان دەکەن لەژنانی نەخوێندەوار.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (4) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (5)

لەم خشتەیەدا ری رێژەی 99٪ ی ئەوانەی فۆڕمەکانیان پڕ کردوەتەوە لە پرۆسەی دەنگداندا بەشداریان کردووە، ئەمەش ئاماژەیەکی باشە بۆ ئامادەبونی ژنان بۆ پرۆسەکانی هەڵبژاردن. لەبەر ئەوەی کە لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە ژنان بوارێکی زیاتریان لەبەردەمدا والآ بووە بۆ بەشداریکردن لەو پرۆسانەی کە پەیوەندی بە ژیانی سیاسی کۆمەڵگاوە هەیە، کە ژنانیش بەشێکن لەو کۆمەڵگەیە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (5) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (6)

لە 1٪ سەرجەم ئەوانەی فۆڕمەکەیان پڕ کردووەتەوە کە دەکاتە 43 کە بەشداریان لە پرۆسەی هەڵبژاردن نەکردووە، لەم ژمارەیەدا تەنیا 9 کەس دەکاتە 21٪ ی کۆی ژمارەکە رێگایان پینەدراوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ عەقڵییەتی پیاوسالاری کە ژن بە مرۆڤێکی خاوەن ماف نازانێت، کە دیارە ئەو رێژەیەش زۆر کەمە لە رێگای پێنەدراوە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (6) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (7)

لەو 16 کەسەی کە لەوەڵامدا دەڵێن بەگرنگمان نەزانیوە 10 کەسیان بڕوایان بەهەڵبژاردن نییەو دوو کەسیان هەست ناکەن مافەکانیان لەو ڕێگایەوە بێتە دی و چوار کەسیش پێیان وایە هەڵبژاردن کاری ژنان نییە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (7) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (8)

لەو 16 کەسەی کە بڕوایان بە هەڵبژاردن نییە 8 کەسیان بڕوایان وایە هەڵبژاردنەکە دیموکراتیەتی تیا نییەو 5 کەسیشیان دەڵێن هەڵبژاردن ناتوانێ کێشەی ژنان چارەسەر بکاتو تەنیا دوو کەش لەوان بێ ئومێدی خۆیان لە لیستەکان دەردەبڕن. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەشێك لە ژنان هوشیارییەکی ئەوتۆیان لەبارەی هەڵبژاردنەوە نییە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (8) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (9)

لەو 9 کەسەی ڕێگریان لێکراوە 3 کەسیان هاوسەرەکانیان ڕێگای نەداون بەشداری بکەن و 6 کەسی دیکەیان بەبێ ئاماژەدان بەکەسەکە دەڵێن کەسانی تر!! کە ڕەنگە ئەمەش بۆ کەسێك کە بیەوێ توێژینەوە بکات قورس بێت لەبەر ئەوەی دیاری نەکراوە کەسەکە برایە، باوکە، دایکە یان خزمی دیکە!!

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (9) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (10)

ئەوانەی بەشداری هەڵبژاردنیان کردووە 82٪ لەژێر کاریگەری خێزان‌و 13٪ کەس لەژێر کاریگەری بنەماڵەو 3٪ بەهۆی حیزبی بونەوە بەشداریان کردووە... تەنها 1٪ هۆکاری نەتەوەییان دیاری کردوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە پەیوەندی ژنان بە مەسەلە سیاسییەکانەوە لەرێگای کەس‌و کارو بنەماڵەو حیزبەکانەوەیە نەك پەیوەندی خۆیان بەمەسەلە نەتەوەییی‌و نیشتمانییەکانەوە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (10) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (11)

78٪ ی ئەوانەی بەشداری هەڵبژاردنیان کردووە پێیان وایە ئەو بەشداری کردنە رۆڵێکی زۆر دەگێڕێ لە گۆڕاندا یاخود گۆڕانکاری باشی لێدەکەوێتەوە... تەنها 1٪ بڕوایان وایە هیچ دەرەنجامیکی نابێت. بۆیە دەتوانین بڵێین کە ژنان بەشێکی زۆریان پێیان وایە بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکان بەواتای بەشدارییانە لە گۆڕانکاریەکان بەقازانجی خۆیان.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (11) بڕوانە پاشکۆکان

نەخشەی ژمارە (12)

96 ٪ ی بەشداربوان ئەوانەی فۆڕمەکانیان پڕ کردوە ئەوە بڕوایان وایە کە بەشداری لە پرۆسەی هەڵبژاردن مافەکانیان دەستەبەر دەکات لەبەرابەردا تەنها 3٪ دەڵێن بەشداری مافەکان دەستەبەر ناکات‌و 1٪ یش نازانن.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (12) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (13)

77٪ ی ئەوانــەی بەشـداری پڕکردنــەوەی فۆڕمەکــەیان کــردووە پێیــان وایــە نوێنــەرە هەڵبــژێردراوەکان دەتــوانن کێــشەکانی ژنــان بخەنــە روو. ئەمــە لەکاتێکدا تەنیا 2٪ دەڵێن نەیانتوانیوە. ئەو رێژە زۆرە لەبەشداربوان، دڵنیان لــەوەی کــە نوێنەرەکــەیان چارەســەرەکەیان دەکــات بۆیــە بەشــدارییان لــە هەڵبژاردنەکاندا کردووە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (13) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (14)

لـەو 840 کەسـەی کـە پێیـان وایـە نوێنـەرەکان وەك پێویـست نـەیانتوانیوە مافەکانی ژنـان بخەنـە روو، 207 کەسـیان پێیـان وایـە کۆمەڵگە رێگـرەو 38 کەسیان پێیان وایە ئاین. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئـەوەی کـە ژنـان بەشـێکیان باوەڕیان بە نوێنەراکانیان نییە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (14) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (15)

لەکۆی 3808 کەس 3329 کەس کە دەکاتـە 87٪ی ژمارەکـە پەشـێمان نـین لــە بەشــداری کــردن لــە هەڵبــژاردنو 442 کــەس کــە دەکاتــە رێــژەی 2٪ پەشـێمانن، هەڵبـەت ئـەم ژمارەیـە بەتێپـەڕبوونی کـات رەنگـە بـەرەو سـەر بڕوات.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (15) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (16)

40 ٪ی بەشداربوان ئەوانەی فۆڕمەکانیان پڕ کردووەتەوە هیچ زانیاریـەکیان سـەبارەت بـە بەنـدەکانی دەسـتور نییـە، کـە ئەمـەش بـۆ خـۆی نیـشانەی بـێ ئاگـایی هاوڵاتیـان لـەو پرسـە گرنگـە دەردەخـات، ئەمـە لەکاتێکـدا 59٪ ی بەشداربوان بەئاگایی خۆیان سەبارەت بە بەندەکانی دەستور دەردەبڕن لەبەر ئـەوەی دەسـتوری عێراقـی بەپرۆسـەیەکی دیموکراسـی تـەواودا تێنەپـەڕیووە بۆیــە زۆرینــەی کۆمــەڵگا ئاگــای لــە بەنــدەکانی دەســتور نــەبووە، کــە ئــەو خشتەیەش ئەوە دەردەخات.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (16) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (17)

لەو ژمارەیەی کە لەخشتەی پێشودا ئاگایی خۆیان سەبارەت بە بەندەکانی دەستور دەربڕیوە 71٪ ی لەرێگای میدیاوە ئاگاداری بەندەکانی دەستورن. واتە لەرێگای رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆنەوە.

10٪ لە رێگای حیزبەوە

11٪ لە رێگەی دیکەوە.

کە دیاری نەکراوە وەك قسەوباسیماڵەوەو گفتو گۆی خێزانی.

5٪ لەرێگای ریکخراوەکانەوە.

ئەمەش بۆ خۆی نیشانەی ئەوەیە کە رێکخراوەکان نەیانتوانیوە وەك پێویست کار بکەن.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (17) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (18)

ئەوانەی کە شارەزایی یان زانیاریان لە بەندەکانی دەستور نییە 77 ٪ یان دەڵێن هیچ ڕێگایەکمان دەستنەکەوتووە بۆ وەرگرتنی زانیاری ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە بەشێکی زۆر لەوانە تائێستا دەستیان ناگات بەمیدیای بینراوو بیستراو.... لەگەڵ ئەوەشدا ڕاگەیاندنەکان کەمترین بایەخییان بە پرۆسەی دەنگدان بۆ دەستور نەداوە بۆیە ژنان بێئاگایی خۆیان دەردەبڕن.
بۆ بینینی خشتەی ژمارە (18) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (19)

لە 52٪ ژنان ڕازین لە دەستور کە ئەمەیش پێچەوانەی خشتەی ژمارە (18)یە کە زۆرینە بێئاگایی خۆیان دەردەبڕن لە دەستور، ئەو جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی هوشیاریو ناهوشیاری هاوڵاتیان.
بۆ بینینی خشتەی ژمارە (19) بڕوانە پاشکۆکان

خشتەی ژمارە (20)

لە 55٪ ژنان پێیان وایە کە ئەو ڕێژەیەی لەدەستوردا بۆیان دیاری کراوە پەسەندە، لە 44٪ یش پێیان وایە کەمتر وایە، واتە ئەو دوو ئامارە لەیەکەوە نزیکە کە مەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی نزمی خوێندەواری ژنانو ئەو چەپاندنەی لەسەریانە لە کۆمەڵگادا

خشتەی ژمارە (21)

بەشێك لە ژنانی بەشداربووی راپرسییەكە، كە زۆرینەیە، لە 58٪ پێیان وایە هوشیاری ژنان لەو ئاستەدا نییە كە ئەو رێژەیەیان پێ بدرێت، ئەمەش ئەوە دەردەخات كە ژنان كەمترین ئاگاییان لەبارەی مافەكانی خۆیانەوە هەیە.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (21) بڕوانە پاشكۆكان

خشتەی ژمارە (22)

لە 65٪ ژنان پێیان وایە بۆ چەسپاندنی مافەكانیان لە دەستوردا پێویستییان بە هوشیاری زیاترەو لە 11٪ پێیان وایە كە دەبێت بەشداری سیاسییان هەبێت، بەگشتی زۆرینە پێیان وایە كە دەبێت خۆیان هوشیار بكەنەوەو مافەكانیان بچەسپێنن.

بۆ بینینی خشتەی ژمارە (22) بڕوانە پاشكۆكان

## راسپاردەکان

- پێویستە دەرفەتی تێکەڵاوبوونی نێرو مێ زیاد بکرێت بۆ ئەوەی ئەو دوو رەگەزە نامۆ نەبن بەرامبەر بەیەکتر و زیاتر ئاشنابن بە کەسایەتی یەکتر.
- مێینە وەکو شەرەفی بنەماڵەو خێڵ تەماشا نەکرێت، بەهۆی ئەوەوە زۆر لە دەرفەتەکان لەکیس چوون دەرئەنجام بووەتە هۆی لاواز بوونی بەشدارییان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا و بەتایبەت لە کاری سیاسیدا.
- بەتواناکردنی مێینە و هوشیارکردنیان بەرامبەر بە مافەکانیان و بەرزکردنەوەی رادەی هوشیاری سیاسی،
- رێگەدان بە خوێندنی کچان و بێ بەش نەکردنیان لە تەواو کردنی قۆناغەکانی خوێندن، ئەویش بە ڕەخساندنی دەرفەتی یەکسان بۆ نێرو مێ بە بێ جیاوازی کردنیان.
- کارکردن لەسەر گۆڕانکاری لە مەنهەجی خوێندن هەر لە قۆناغە سەرەتاییەکانەوە، کە بە ئاشکرا رەگەزی مێ و نێری جیاکردۆتەوە، بەبەستنەوەی رەگەزی مێینە بە منداڵ بەخێوکردن و کاروباری ناو ماڵ، لە کاتێکدا رەگەزی نێر خەریکی ئەو کارانەیە کەتایبەتە بە نان پەیدا کردن و بڕیاردان و ئیشو کاری دەرەوەیە.
- ئاسانکاری کردن بۆ رەگەزی مێینە بە هاتنەپێشەوە بۆ ناوەندەکانی بڕیارو بەشداری پێ کردنیان لە پۆستەکانی

بڕیارداندا بە مەبەستی بەرەودان بە تواناکانیان و زیادکردنی شارەزاییان.

- زیاد کردنی دەرفەتی کار بۆ مێینە و رزگارکردنی لە دەستپانکردنەوەو دەرۆزەکاری لە رەگەزی نێرینە، چونکە مرۆڤ ئازاد نابێت گەر سەربەخۆی ئابووری بەدەست نەهێنێت و هەر بە چەوساوەیی دەمێنێتەوە.

## دەرئەنجامەکانی توێژینەوەکە

1- تائێستا بەرێژەیەکی بەرچاو لەژنان ناتوانن خۆیان ڕاستەوخۆ بەشداری کایە سیاسی وکۆمەلآیەتیەکان بکەن، دیارە نەخوێندەواری وئاستی نزمی نەخوێندەواریش ڕۆڵی خۆی هەیە .بۆنمونە ئێمە لەکۆی ژمارەی وەرگیراو 36٪ نەخوێندەوارن هەروەها 26٪ تەنهاسەرەتاییان خوێندوە ،کەواتە نەبونی هۆشیاری لەمپەرێکی گەورەیە لەبەردەم بەشداری کردندا .

2- سەرەڕای ئەوەی کەبەبەراورد لەگەڵ ڕابردوودا پێشکەوتنی بەرچاو دەبینێت ، بەلآم هێشتا خەڵکانێك هەن ڕێگایان پێنادرێت تەنانەت بەشداری هەڵبژاردنیش بکەن .

3- هەروەك لەڕێگای ئەم توێژینەوەیەوە گەیشتینە ئەودەرئەنجامەی کەتائێستا بەشێکی زۆر لەژنان لەژێرکاریگەری خێزان و بنەماڵەدا بەشداری ئەوپرۆسانە دەکەن ، نەك بەئازادی خۆیان .

4- پۆزەتیف ئەوەیەکە 78٪ ی بەشداربوان پێیان وایە یەشداری هەڵبژاردن ڕۆڵی هەیە لەگۆڕانکاری کۆمەڵگاداو نزیکەی 96٪ ی پێیان وایە لەڕێگای بەشداری هەڵبژاردنەوە مافەکانیان دەستەبەردەبێت .

5- دەرئەنجامێکی دیکە متمانەی زۆربەی بەشداربوانە بەوکەسانەی دەنگیان بۆدەدەن و زۆربەشیان لەبەشداربونیان لەوپرۆسەیەدا پەشیمان نین .

6- دەرئەنجامێکی دیکەی کەپێی گەیشتین کەسی شارەزای بەشداربوان بوو لەبەندەکانی دەستوور بەڕادەیەك لە 40٪ هیچ شارەزاییەکیان لەبارەیەوە نەبوە

# پاشکۆی ژمارە (1) خشتەکان

خشتەی ژمارە (1)- دەرخستەی تەمەن

| گروپەکان | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| 18-23 | 756 | 20% |
| 24-29 | 804 | 20% |
| 30-35 | 764 | 20% |
| 36-40 | 459 | 12% |
| 41-46 | 387 | 10% |
| 47بەرەو سەرەوە | 681 | 18% |
| | 3851 | 100% |




شێوەی ژمارە (1)- دەرخستەی تەمەن

خشتەی ژمارە (2) – دابەشبوون بەگوێرەی شوێنی دانیشتن

| شوێن | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| شار | 2397 | 63% |
| قەزا | 575 | 15% |
| ناحیە | 672 | 17% |
| گوند | 207 | 5% |
| | 3851 | 100% |




شێوەی ژمارە (2) – دابەشبوون بەگوێرەی شوێنی دانیشتن

خشتەی ژمارە (3) – باری کۆمەڵایەتی

| باری کۆمەڵایەتی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| کچ | 1118 | 29% |
| ژن | 2289 | 59% |
| بێوەژن | 444 | 12% |
| | 3851 | 100% |




شێوەی ژمارە (3) – باری کۆمەڵایەتی

### خشتەی ژمارە (4) – ئاستی خوێندن

| ئاستی خوێندن | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| نەخوێندەوار | 1369 | 36% |
| خوێندەوار | 164 | 4% |
| سەرەتایی | 1002 | 26% |
| ناوەندی | 591 | 15% |
| ئامادەیی | 337 | 9% |
| پەیمانگاو زانکۆ | 388 | 10% |
| | 3851 | 100% |




شێوەی ژمارە (4) – ئاستی خوێندن

**خشتەی ژمارە (5) – ئاستی بەشداری**

| ئاستی سەدی | ژمارە | پ 1/ ئایا بەشداریت کردووە لە پرۆسەی دەنگدان | |
|---|---|---|---|
| 99% | 3808 | أ | بەڵێ |
| 1% | 43 | ب | نەخێر |
| 100% | 3851 | | |




**شێوەی ژمارە (5) – ئاستی بەشداری**

خشتەی ژمارە (6) – هۆکاری بەشداری نەکردن

| پ 2/ هۆی بەشداری نەکردنت چیەیە؟ | | ژمارە | ئاستی سەدی |
|---|---|---|---|
| ماوەم نەبوو | أ | 16 | 37% |
| بە گرنگی نازانم | ب | 16 | 37% |
| ڕێگەم پێ نەدرا | ج | 9 | 21% |
| نازانم | | 2 | 5% |
| | | 43 | 100% |




شێوەی ژمارە (6) – هۆکاری بەشداری نەکردن

### نەخشەی ژمارە (7)

| پ 3/ بۆچی بەگرنگی نازانیت؟ | | | |
| --- | --- | --- | --- |
| بروام بە هەڵبژاردن نیە | أ | 10 | 62% |
| هەست ناکەم مافەکان تیایدا بەرجەستە بوو بێت. | ب | 2 | 13% |
| کاری ژن نیە | ج | 4 | 25% |
| | | 16 | 100% |




شێوەی ژمارە (7)

**خشتەی ژمارە (8) – هۆکارەکانی بڕوا نەبوون بە هەڵبژاردن**

| پ 4/ بۆچی بڕوات بە هەڵبژاردن نییە؟ | | | |
|---|---|---|---|
| بەشێوەیەکی دیموکراتییانە ناکرێت | أ | 8 | 50% |
| بێ ئومێدم لە لیستەکان | ب | 2 | 13% |
| ئەندامەکان نوێنەری حیزبەکانن | ج | 1 | 6% |
| هیچ گۆڕانکارییەك لە کێشەکانی ژنان نایەتەدی | د | 5 | 31% |
| | | 16 | 100% |




**شێوەی ژمارە (8) – هۆکارەکانی بڕوا نەبوون بە هەڵبژاردن**

**خشتەی ژمارە (9) – ڕێگرەكان**

| پ 5/ كێ ڕێگر بوو؟ | | | |
|---|---|---|---|
| باوك | أ | 0 | 0% |
| برا | ب | 0 | 0% |
| هاوسەر | ج | 3 | 33% |
| كەسێكی تر | د | 6 | 67% |
| | | 9 | 100% |




**شێوەی ژمارە (9) – ڕێگرەكان**

خشتەی ژمارە (10) – پاڵنەری هەڵبژاردن

| | | | |
|---|---|---|---|
| | پ 6/ پاڵنەری بەشداری کردنت لە هەڵبژاردنەکان؟ | | |
| خێزان | أ | 3108 | 82% |
| بنەماڵە | ب | 512 | 13% |
| حیزب | ج | 109 | 3% |
| نەتەوە | د | 46 | 1% |
| | نازانم | 33 | 1% |
| | | 3808 | 100% |




شێوەی ژمارە (9) – پاڵنەری هەڵبژاردن

خشتەی ژمارە (11) –كاریگەری بەشداریكردن

| پ 7/ تاچەند بەشداریت كایگەری دەبێت لە گۆڕاندا؟ | | | |
|---|---|---|---|
| زۆر | أ | 2987 | 78% |
| مامناوەند | ب | 612 | 16% |
| كەم | ج | 190 | 5% |
| هیچ | د | 20 | 1% |
| | | 3809 | 100% |




شێوەی ژمارە (11) –كاریگەری بەشداریكردن

خشتەی ژمارە (12) –رۆڵی بەشداری لە مافدا

| | | | |
|---|---|---|---|
| | پ 8/ بروات وایە بە بەشداری کردن مافەکانت دەستەبەردەبێت؟ | | |
| 96% | 3726 | ا | بەڵێ |
| 3% | 105 | ب | نەخێر |
| 1% | 20 | نازانم | |
| 100% | 3851 | | |




شێوەی ژمارە (12) –رۆڵی بەشداری لە مافدا

**خشتەی ژمارە (13) –رادەی بڕوان بوون بەنوێنەران**

| | پ 9/ تا ض رادةيةك نويَنةرة هةلبذيَرراوةكان توانيويانة مافةكانى ذنان بخةنة روو؟ | | |
|---|---|---|---|
| 77% | 2991 | أ | زۆر |
| 15% | 569 | ب | مامناوةند |
| 5% | 201 | ج | كةم |
| 2% | 70 | د | هيض |
| 1% | 20 | نازانم | |
| 100% | 3851 | | |




**شێوەی ژمارە (13) –رادەی بڕوان بوون بەنوێنەران**

خشتەی ژمارە (14)

| | | | |
|---|---|---|---|
| پ 10/ بۆضی (مامناوةند, كةم, هیض)؟ | | | |
| ئامانج لة خۆ ثالاوتن ثؤستة | أ | 468 | 55% |
| ریَطةیان ثىَ نادریَت لةلایةن كؤمةلَطای ثیاوسالاریيةوة | ب | 307 | 37% |
| ئاین ریَطرة | ج | 38 | 5% |
| نازانم | | 27 | 3% |
| | | 840 | 100% |




شێوەی ژمارە (14)

**خشتەی ژمارە (15) - پەشێمانبوونەوە**

| | | | |
|---|---|---|---|
| پ 11/ ئايا ثةشيمانيت لة بةشدارى كردنت لة هةلَبذاردنةكان؟ | | | |
| بةلَى | أ | 442 | 12% |
| نةخيَر | ب | 3329 | 87% |
| نازانم | | 37 | 1% |
| | | 3808 | 100% |




**شێوەی ژمارە (15) - پەشێمانبوونەوە**

**خشتەی ژمارە (16) – شارەزایی دەربارەی دەستوور**

| | | | |
|---|---|---|---|
| پ 12/ هيض زانيارىیەكت دەربارەی بەندەكانی دەستوور هەیة. | | | |
| بەلَى | أ | 2297 | 59% |
| نەخيَر | ب | 1531 | 40% |
| نازانم | | 23 | 1% |
| | | 3851 | 100% |




**شێوەی ژمارە (16) – شارەزایی دەربارەی دەستوور**

**خشتەی ژمارە (17) – ڕێگاکان شارەزایی لە دەستور**

| پ 13/ بة ض ريَطايةك؟ | | | | |
|---|---|---|---|---|
| بلاوكراوةكان | أ | 1626 | 71 |
| حيزب | ب | 224 | 10% |
| ريَكخراوةكان | ج | 120 | 5% |
| هى تر | د | 256 | 11% |
| نازانم | | 71 | 3% |
| | | 2297 | 71.29 |




**شێوەی ژمارە (17) – ڕێگاکان شارەزایی لە دەستور**

خشتەی ژمارە (18) – نەبوونی زانیاری

| پ 14/ بۆضی زانیاریت نیية؟ | | | |
|---|---|---|---|
| بةطرنطی نازانم | أ | 98 | 5% |
| بروام ثێی نیية | ب | 183 | 12% |
| بة هيض شيَوةيةك دةستم نةكةوت | ج | 1171 | 77% |
| نازانم | | 79 | 5% |
| | | 1531 | 99% |




شێوەی ژمارە (18) – نەبوونی زانیاری

**خشتەى ژمارە (19) – دەستورو مافى ژنان**

| | | | |
|---|---|---|---|
| پ 15/ تا ض رادەيەك دەستور مافەكانى ذنانى بەرضاو طرتووە؟ | | | |
| زۆر | أ | 1609 | 52% |
| مام ناوەند | ب | 1004 | 33% |
| كەم | ج | 299 | 10% |
| نازانم | | 139 | 5% |
| | | 3051 | 100% |




**شێوەى ژمارە (19) – دەستورو مافى ژنان**

## خشتەی ژمارە (20)

| پ 16/ ئەو ریَذەیەی کە دەستوور بەشداری ذنانی دیاری کردووة ضؤن دەبینیت؟ | | | 55% |
|---|---|---|---|
| باشة | أ | 2109 | 44% |
| کەمتر بووایة | ب | 1701 | 1% |
| زیاتر بوایة | ج | 42 | 100% |
| | | 3852 | |




شێوەی ژمارە (20)

خشتەى ژمارە (21)

| | | | |
|---|---|---|---|
| پ 17/ بۆضى ثيَت واية كةمتر بواية؟ | | | |
| هوشيارى ذنان لةو ئاستة نىية | أ | 990 | 58% |
| طرنط نىية بةشدارىكردنةكةى | ب | 336 | 20% |
| نازانم | | 368 | 22% |
| | | 1694 | 100% |




شێوەی ژمارە (21)

خشتەی ژمارە (22)

| | | | |
|---|---|---|---|
| | پ 18/ ضۆن ذنان دةتوانن مافةكانيان بضةسثيَنن لة دةستوردا؟ | | |
| 65% | 2521 | أ | هوشيارى زياترى ذنان |
| 11% | 430 | ب | ضوونة ناو كايةى سياسى |
| 8% | 289 | ج | نويَنةرايةتى كردنى راستةقينةى ذنان |
| 14% | 542 | د | ضةسثاندنى ياساكانى كةسيَتى لة قازانجى ذان |
| 2% | 69 | | نازانم |
| 100 % | 3851 | | |




شێوەی ژمارە (22)

# پاشکۆی ژمارە (2) – فۆڕمی

**فۆرمی راپرسی سەبارەت بە (ژن و بەشداری سیاسی )**

**بەشی زانیاری**

**ژمارەی فۆرم:** **بەروار:**

**رەگەز: تەنها مێ** **کات:**

**تەمەن:**

**شوێن :**

**باری خێزان:**

**ئاستی خوێندن خوێندەوارە**

**نەخوێندەوارە**

**پلەی خوێندن: سەرەتایی ناوەندی**

**دواناوەندی پەیمانگاوزانکۆ**

| پرسارەکان | تێبینی |
|---|---|
| 1. ئایا بەشداریت کردووە لە پرۆسەی دەنگدان؟<br><br>أ بەڵێ | بچۆ بۆ پرسیاری شەشەم<br><br>بچۆ بۆپرسیاری دووەم |

| | |
|---|---|
| ب نەخێر | |
| 2. هۆی بەشداری نەکردنت چی‌یە؟<br>أ ماوەم نەبوو<br>ب. بە گرنگی نازانم<br>ج. ڕێگەم پیێ نەدرا | <br><br>بچۆ بۆ پرسیاری سێ<br>بچۆ بۆ پرسیاری پێنجەم |
| 3. بۆچی بەگرنگی نازانیت؟<br>أ. بروام بە هەڵبژاردن نی‌یە<br>ب. هەست ناکەم مافەکان تیایدا بەرجەستە بوو بێت.<br>ج. کاری ژن نی‌یە | <br>بچۆ بۆ پرسیاری چوارەم |
| 4.بۆچی بروات بە هەڵبژاردن نی‌یە؟<br>ا. بەشێوەیەکی دیموکراتی‌یانە ناکرێت<br>ب. بیێ ئومێدم لە لیستەکان<br>ج. ئەندامەکان نوێنەری حیزبەکانن<br>د. هیچ گۆرانکاری‌یەك لە کێشەکانی ژنان نایەتەدی. | |
| 5. کیێ ڕێگر بوو؟<br>أ باوك<br>ب. برا<br>ج. هاوسەر<br>د. کەسێکی تر | |
| 6. پاڵنەری بەشداری کردنت لە | |

| | |
|---|---|
| هەڵبژاردنەکان؟<br>ا. خێزان 3126<br>ب. بنەماڵە527<br>ج. حیزب113<br>د. نەتەوە48<br>هـ- نازانم: 25 | |
| 7. تاچەند بەشداریت کایگەری دەبێت لە گۆڕاندا؟<br>أ. زۆر<br>ب. مامناوەند<br>ج. کەم<br>د. هیچ | |
| 8. بروات وایە بە بەشداری کردن مافەکانت دەستەبەردەبێت؟<br>أ بەڵێ<br>ب. نەخێر | |
| 9. تا چ رادەیەك نوێنەرە هەلبژێرراوەکان توانیویانە مافەکانی ژنان بخەنە روو؟<br>أ. زۆر<br>ب. مامناوەند<br>ج. کەم<br>د. هیچ | بچۆ بۆ پرسیاری یازدە<br>بچۆ بۆ پرسیاری دەیەم |
| 10. بۆچی (مامناوەند, کەم, هیچ)؟<br>أ. ئامانج لە خۆ پالاوتن پۆستە<br>ب. رێگەیان پێ نادرێت لەلایەن | |

| | |
|---|---|
| کۆمەڵگای پیاوسالاری‌یەوە<br>ج. ئاین ڕێگرە | |
| 11. ئایا پەشیمانیت لە بەشداری کردنت لە هەڵبژاردنەکان؟<br>أ بەڵی<br>ب. نەخێر | |
| 12. هیچ زانیاری‌یەکت دەربارەی بەندەکانی دەستوور هەیە.<br>أ. بەڵیٚ<br>ب. نەخێر | <br><br>بچۆ بۆ پرسیاری سیازدە<br>بچۆ بۆ پرسیاری چواردە |
| 13. بە چ ڕێگایەك؟<br>أ. بلاوکراوەکان<br>ب. حیزب<br>ج. ڕێکخراوەکان<br>د. هی تر | |
| 14. بۆچی زانیاریت نی‌یە؟<br>أ. بەگرنگی نازانم<br>ب. بروام پیٚی نی‌یە<br>ج. بە هیچ شێوەیەك دەستم نەکەوت | |
| 15. تا چ ڕادەیەك دەستور مافەکانی ژنانی بەرچاو گرتووە؟<br>أ. زۆر<br>ب. مام ناوەند<br>ج. کەم | |
| 16. ئەو ڕێژەیەی کە دەستوور بەشداری | |

| | |
|---|---|
| ژنانی دیاری کردووە چۆن دەبینیت؟<br>أ. باشە<br>ب. کەمتر بووایە<br>ج. زیاتر بوایە | <br>بچۆ بۆ پرسیاری 18<br>بچۆ یۆ پرسیاری 17<br>بچۆ بۆ پرسیاری 18 |
| 17. بۆچی پێت وایە کەمتر بوایە؟<br>أ. هوشیاری ژنان لەو ئاستە نییە<br>ب. گرنگ نییە بەشداریکردنەکەی | |
| 18. چۆن ژنان دەتوانن مافەکانیان بچەسپێنن لە دەستوردا؟<br>أ. هوشیاری زیاتری ژنان<br>ب. چوونە ناو کایەی سیاسی<br>ج. نوێنەرایەتی کردنی راستەقینەی ژنان<br>د. چەسپاندنی یاساکانی کەسێتی لە قازانجی ژان | |
| | |

سەرپەرشتیار

پر کراوەتەوە لەلایەن:

ناو:

واژوو

## پاشکۆی ژمارە (3) لیستی بەشداران

| ژمارە | ناوی سیانی | پۆست | ناوی ڕێکخراو |
|---|---|---|---|
| 1 - | عبدالوهاب رحیم کریم | سەرپەرشتیار | =========== |
| 2 - | فەرهاد بەهادین | مۆنیتەر | =========== |
| 3 - | فەرهاد ئەحمەد | مۆنیتە | =========== |
| 4 - | سندس مەولود | تیم لیدەر | سەنتەری پەنا |
| 5 - | کەژاڵ فاتح فەرەج | تیم لیدەر | سەنتەری پەنا |
| 6 - | محمد تاهیر | تیم لیدەر | سەنتەری پەنا |
| 7 - | دڵسۆز سابیر کەریم | تیم لیدەر | سەنتەری پەنا |
| 8 - | یسری محمد حسن | تیم لیدەر | سەنتەری پەنا |
| 9 - | سۆران محمد عەزیز | تیم لیدەر | سەنتەری پەنا |
| 10 - | هاجەر ئەحمەد ڕەزا | ئەندام تیم | C.D.O سەنتەری چالاکی ژنان |
| 11 - | هەڵبەست ئەمین | ئەندام تیم | C.D.O سەنتەری چالاکی ژنان |
| 12 - | گوڵاڵە ماهیر محمد | ئەندام تیم | یەکێتی ژنان |
| 13 - | ندی کامل | ئەندام تیم | یەکێتی ژنان |
| 14 - | ساهرە محمد | ئەندام تیم | ژیان بۆ ژنانی ئەنفال |
| 15 - | گوڵەباخ ئەحمەد محمد | ئەندام تیم | ژیان بۆ ژنانی ئەنفال |
| 16 - | نادیە محمد عەباس | ئەندام تیم | ڕێکخراوی خۆر |
| 17 - | بنار محمد کەریم | ئەندام تیم | ڕێکخراوی خۆر |
| 18 - | **اپیرە نۆیل منی** | ئەندام تیم | **اتحاد نساو بیت نهرین** |
| 19 - | **حدباو پامرصادق** | ئەندام تیم | **اتحاد نساو بیت نهرین** |
| 20 - | ایڤیت جمیل گورگیس | ئەندام تیم | **اتحاد نساو بیت نهرین** |
| 21 - | ئەدیبە حکیم حمید | ئەندام تیم | کرا |
| 22 - | شیرین وهاب حسن | ئەندام تیم | کرا |
| 23 - | امل خلیل نجم الدین | ئەندام تیم | کوردس |
| 24 - | خالدە عبدلحمید | ئەندام تیم | کوردس |
| 25 - | ماردین قادر اسماعیل | ئەندام تیم | شروق |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 26 - | ساجده احمد ابراهیم | ئه‌ندام تیم | شروق |
| 27 - | نیشتمان عبدالرحمن حسن | ئه‌ندام تیم | شروق |
| 28 | سه‌لام مارف قادر | داته ئینته‌ری | - |
| 29 | ئاوات محه‌مه‌د پیروه‌یس | داته ئینته‌ری | |
| 30 | یاسین محمه‌د | داته ئینته‌ری | |
| 31 | یاسین عه‌بدولره‌حمان ئه‌حمه‌د | سه‌رپرشتیاری توێژینه‌وه | |

illiterate and 26% was with primary education, so that the absence of education is considered a great obstruction informative participation .

Moreover; by comparison with the past we see the sight of development. Bat yet, there are some people who are not permitted even to participate the elections.
We also result from the study that, the greatest number of participants was confiding with the effects of family not with there own decision.

Appositive result is that 78% of the participants consider that participating in the selection has arole in social development and about 96% consider that by participating in the selection can yet Teri own rights.
Another result is that the participants have confidence to those who they select (choose) and most of them are net penitent about the participation project.
The study showed also that very few of the people who participated had not any know ledge about articles of constitution (charter)
The study includes four chapters in addition to the consul's ions and recommendation.

The first chapter includes the introduction introduction, the problem and objectives.

The second chapter covers the theoretical approach of study. The third chapter includes identity fying the study region and the fourth chapter includes representation and result analysis.

The study population included all the wives in kirkuk city , the large towns (Dubiz, prde and Daquk ), the towns (Redar, Qarahanjeer, Taza and Laylan) . and villages. After the determination of population, randomized sample was taken which represents more than 5% of the population, information were collected by the questionnaire which were designed for this papoose .

The study result reveal that, yet , the sight of proportion of the wives unable to participate the political and social work directly, hence the illiteracy and low level of education phenomenon have areole , For example 36% of the total sample was

# Abstraet

Determining political participating phenomenon is one of the most important subject in money field of political and social science this phenomenon is one of the positive proper ties, in many counties it has become general appearance without any gender borders (constrains).

Although all changes accrued resulting of scientific development, we note in many countries, especially those lagged social system, the seeable wives share in social and political work, but we can not say the people participation, especially of female gender come from democracy believes and probability of changes, In fact its routine our of repeated work.

So we try in this study to achieve the following aims;

1-Determination of wives political participation in kirkuk city , large towns , and villages based on (age, education level, family state level and occupation level) .

2-Evaluating participation level in all Factors we determined.